# ماددەی (١٤٠)ی دەستووری هەمیشەیی عێراق

## ناوەرۆکی، بنەڕەتی، تەگەرەکانی و ئاسۆی ئاییندەی




د. ئازاد عوسمان

ح





**خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە**

● **ماددەی (١٤٠)ی دەستووری هەمیشەیی عێراق**

ناوەڕۆکی، بنەڕەتی، تەگەرەکانی و ئاسۆی ئایندەی

● **نووسینی:** د. ئازاد عوسمان مامۆستا لە کۆلێژی یاسا و ڕامیاری

(زانکۆی سەلاحەدین — هەولێر)

● **نەخشەسازی ناوەوە:** گۆران جەمال ڕواندزی

● **بەرگ:** ڕێمان عەبدولجەبار

● **نرخ:** ١٥٠٠ دینار

● **چاپی یەکەم** ٢٠١٣

● **تیراژ:** ٥٠٠ دانە

● **چاپخانەی** موکریانی (هەولێر)

● بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەی گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٢٥٣١) ساڵی ٢٠١٣ی پێی دراوە.

**زنجیرەی کتێب (٧٧٥)**





ماڵپەڕ: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com

# ناوەرۆك

## ناوەرۆکی ماددەی (١٤٠)ی دەستووری هەمیشەیی عێراق (٢٠٠٥)

یەکەم: دەسەڵاتی جێبەجێکردن ﴿واتە حکومەت﴾ هەنگاوی پێویست دەهاوێت بۆ تەواوکردنی جێبەجێکردنی پێداویستەکانی هەموو بڕگەکانی ماددەی (٥٨) لە یاسای بەڕێوەبردنی دەوڵەتی عێراق بۆ قۆناخی گواستنەوە.

دووەم: ئەو بەرپرسییەی کەوتووەتە سەرشانی دەسەڵاتی جێبەجێکردن لە حکومەتی گواستنەوەدا و لە ماددەی (٥٨)ی یاسای بەڕێوەبردنی دەوڵەتی عێراق بۆ قۆناخی گواستنەوە داهاتووە درێژدەبێتەوە بۆ دەسەڵاتی جێبەجێکردن ﴿واتە حکومەتی﴾ هەڵبژێردراو و بەردەوامدەبێت بە پێی ئەم دەستوورە تا بەتەواوی جێبەجێ دەکرێت (ئاساییکردنەوە، سەرژمێریی و کۆتایی دەهێت بە ڕاپرسیی لە کەرکوك و ئەو شوێنانەی دیکە کە کێشەیان لەسەرە بۆ دیارکردنی ویستی هاووڵاتیانیان) لە ماوەیەك ئەوپەڕەکەی ﴿ڕۆژی﴾ سی و یەکەمی مانگی کانوونی یەکەمی ساڵی دووهەزار و حەفتە.

---

**کەواتە بنەڕەتی ماددەکە: ناوەرۆکی ماددە(٥٨)ی یاسای بەڕێوەبردنی دەوڵەتی عێراق بۆ قۆناخی گواستنەوەیە**

## ناوەرۆکی ماددەی (٥٨)ی یاسای بەڕێوەبردنی دەوڵەتی عێراق بۆ قۆناخی گواستنەوە

**(٨ ئادار ٢٠٠٤)**

(أ) حکومەتی گواستنەوەی عێراقی، بەتایبەتی دەستەی باڵای چارەسەرکردنی کێشەکانی موڵکداری عەقاری و لایەنە پێوەندیدارەکانی دیکە، زۆر بەخێرایی، پێڕەوی ڕێوشوێن دەکەن، بۆ لابردنی ئەو ستەمەی کردەوەکانی ڕژێمی پێشوو بوونەتە هۆکاری و کەخۆی لە گۆڕینی باری دانیشتووانی ناوچەی دیاریکراودا دەنوێنێت، لەنێوانیاندا کەرکووك، لە ڕێگەی ڕاگوێزان و دوورخستنەوەی خەڵکی لە جێگەی نیشتەجێبوونیان، بەهۆی کۆچپێکردنی بەزۆر لەناو ناوچەکەدا یان بۆ دەرەوەی و نیشتەجێکردنی خەڵکی نامۆ (غەریب) لە ناوچەکە و بێبەشکردنی دانیشتووان لەکار، لەڕێگەی ڕاستکردنەوەی نەتەوە. بۆ چارەسەرکردنی ئەم ستەمە، دەبێت حکومەتی گواستنەوەی عێراقی ئەم هەنگاوانەی خوارەوە بهاوێت:

١. لەبارەی دانیشتووانی ڕاگوێزراو و دوورخراوە و کۆچپێکراو و کۆچکردوو و بەگونجاویی لەگەڵ یاسای دەستەی باڵای چارەسەرکردنی کێشەکانی موڵکداری عەقاری و ڕێوشوێنە یاساییەکانی دیکە، پێویستە لەسەر حکومەت، لە ماوەیەکی پەسەندا، هەڵبستێت بە گەڕاندنەوەی

دانیشتووان بۆ نێو ماڵ و سەرو موڵکی خۆیان و ئەگەر ئەوەش نەڕەخسا دەبێت حکومەت بەشێوەیەکی دادپەروەرانە قەرەبوویانبکاتەوە.

٢. لەبارەی ئەو کەسانەی گوازراونەتەوە (هاوردراونەتە) جێگە و زەوی دیاریکراو، دەبێت حکومەت بە پێی ماددەی (١٠) یاسای دەستەی باڵای چارەسەرکردنی کێشەکانی موڵکداری عەقاری بڕیار لەسەر پرسەکانیان بدات، بۆ مسۆگەرکردنی نیشتەجێکردنەوەیان، یان وەرگرتنی قەرەبوو لە دەوڵەت، یان دانی زەوی دیکە پێیان لە لایەن دەوڵەت، لە نزیك جێگەی نیشتەجێبوونیان لەو پارێزگایانەی لێیانەوە هاتوون، یان مەسرەفی چوونەوەیان (گەڕانەوەیان) بۆ ئەو جێگەیانە پێبدرێتەوە.

٣. لەبارەی ئەو کەسانەی بێبەشکراون لە دامەزراندن وەك فەرمانبەر یان لە ئامرازی گوزەرانی دیکە بۆ ناچارکردنیان بە کۆچکردن لە جێگەی نیشتەجێبوونیان لە ناوچەکان و لەسەر زەوییەکانیان، پێویستە لەسەر حکومەت کەوا هانی پەیداکردنی دەرفەتی نوێی کار بدات بۆیان لەو جێگەو زەوییانە.

٤. بەڵام سەبارەت بە ڕاستکردنەوەی نەتەوە، پێویستە لەسەر حکومەت کە هەموو بڕیارە پەیوەندیدارەکان هەڵبوەشێنێتەوە، و ڕێگە بدات بە خەڵکی زەرەرمەند، لە مافی بڕیاردانی ناسنامەی نیشتمانی و ئینتیمای نەتەوەییان بێ زۆرلێکردن و فشار.

(ب) ڕژێمی پێشوو دەستکاریی سنوور و شتی دیکەی کردووە، بەمەبەستی بەدیهێنانی ئامانجی سیاسی. پێویستە لەسەر سەرۆکایەتی و

حکومەتی گواستنەوەی عێراقی ڕاسپاردە پێشکێش بە کۆمەڵەی نیشتمانی بکەن بۆ چارەسەرکردنی ئەو گۆڕینە نادادپەروەرانە.ئەگەر ﴿دەستەی﴾ سەرۆکایەتی نەیتوانی بەکۆدەنگیی لەسەر کۆمەڵێك ڕاسپاردە ڕێکبکەوێت، دەبێت دەستەی سەرۆکایەتی هەڵبسێت بە دامەزراندنی ناوبژیکارێکی(محکم) بێلایەن و بە کۆدەنگیی بەمەبەستی تاوتوێکردنی بابەتەکە و پێشکێشکردنی ڕاسپاردە. ئەگەر دەستەی سەرۆکایەتی لە توانایدا نەبوو لەسەر ناوبژیکارێك ڕێکبکەوێت، دەبێت دەستەی سەرۆکایەتی داوا لە سکرتێری نەتەوە یەکگرتووەکان بکات بۆ دەستنیشانکردنی کەسایەتییەکی نێودەوڵەتی ناودار بۆ هەڵسان بە ناوبژیکاری داواکراو.

(ج) چارەسەریی کۆتایی زەوییە کێشەلەسەرەکان، لەنێوانیاندا کەرکووك، دوادەخرێت تا خاڵەکانی سەرەوە تەواودەبن و سەرژمێرییەکی دادپەروەرانە و ڕوونی دانیشتووان دەکرێت و تا دەستوور پەسەند دەکرێت. دەبێت ئەم چارەسەرییە بە جۆرێك ئەنجامبدرێت، کە لەگەڵ بیروباوەڕی دادپەروەرییدا بگونجێت و ویستی دانیشتووانی ئەو شوێنانە لەبەرچاوبگرێت.

## هەڵسەنگاندنێکی مادەی (١٤٠)ی دەستووری عێراق

## تایبەت  بە گۆڤاری رۆژەڤ (Rojev)

لە تەمووزی ٢٠٠٧

## پێویستە سەرکردایەتی سیاسی کورد چ بکات بۆ جێبەجێکردنی ماددەی ١٤٠؟

لەم کاتە ناسکەی مێژووی هاوچەرخی کورد و پاشەڕۆژی دەوڵەتی عێراق، ئەم ماددە بنەڕەتییەی دەستووری هەمیشەیی عێراق، بووەتە بابەتێکی گرنگی لێدوان و لێکۆڵینەوە لەناوەوە و دەرەوەی عێراق، جێبەجێکردنیشی بووەتە مەسەلەی یەکلاکەرەوەی: سنووری هەرێمی کوردستان لە چوارچێوەی دەوڵەتی عێراقی فیدراڵدا، واتە چارەسەری بنەڕەتی دۆزی کورد لە عێراق بەتایبەتی و هەمووارکردنی دەستووری عێراق بەپێی ماددەی (١٤٢) ی دەستوور و کاراکردنی دەستووری هەمیشەیی مەبیو و جوولاندنەوەی پرۆسەی سیاسی وەستێندراو (لەلایەن کۆنە بەعسی و داردەستانی وڵاتانی دراوسێ لە نێو چەند فراکسیۆنێکی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق) لە عێراقی نوێ بە گشتی.

لە سەرەتادا بەچاکی دەزانین چەند شتێك لەبارەی ماددەکە شیبکرێتەوە:

- ماددەی (١٤٠) ی دەستووری هەمیشەیی عێراقی پەسەندکراو لەلایەن زۆربەی دانیشتووانی عێراق، نەك تەنیا چارەسەری مەسەلەی زوڵم و زۆری کراو لە خاك

و خەڵكی پارێزگای كەركووك و قەزای مەخموور —لەلایەن ڕژێمی بەعسی فاشی - و مەسەلەی هەندێك لـە ناوچـە دابڕێنـدراوەكانی دیكـەی كوردسـتانی باشـوور هـەر لەسەرەتای دامەزراندنی پاشایەتی عێراقەوە (خانەقین و شێخان و شـەنگال) دەكـات، بەڵكو چارەسەری مەسەلەی دابڕاندنی بەشێكی گەورەی خاكی ناوەڕاستی عێراقیش - بەتایبەتی كەربەلا - دەكات، كە گرنگە بۆ دیاركردنی سنووری هـەرێمی ناوەڕاسـت، یان باشوور لە دەوڵەتی عێراقی فیدراڵ.

- هـەردوو بڕگـەی مـاددەی (١٤٠)ی دەسـتووری هەمیشـەیی عێـراق بەستراونەتەوە بە هەر سێ بڕگەی ماددەی (٥٨)ی یاسـای كـاتی ئیـدارەی دەوڵـەتی عێراق و پەیوەستن بـە جێبـەجێكردنی نـاوەرۆكی مـاددەی (٥٨) لەلایـەن هـەردوو حكومەتی گواستنەوە ( ڕابردوو) و هەمیشەیی (ئێستا).

- میكانیزمی جێبەجێكردنی بڕگەی (ب) ی مـاددەی (٥٨)، كـە چارەسـەری سنوورە ئیدارییە "گۆڕاوەكان بە مەبەستی سیاسی" لە لایەن ڕژێمی بەعس دەكـات، بە پەناوپێچە. لەكاتێكدا دەبوا مەسەلەی ئەو سنوورە شـێواندراوانەی سـێ پارێزگـای كوردستان (كەركوك و دهۆك و هەولێر) و پارێزگای كەربەلا لە ڕێگەی ڕەتكردنـەوەی ئەو بڕیارە ڕەگەزپەرست و تایفەگەرییانـەی ڕژێمـی بـەعس چارەسـەر بكرێـت، كـە لەسەردەمی حوكمرانی ستەمكارانەی بەم مەبەستە داویەتی (بەتایبەتی بڕیاری ژمارە ٤١ ی ساڵی ١٩٧٦ لەبارەی پارچەپارچەكردن و دابەشكردنی پارێزگـای كـەركووك و گۆڕینی ناوی)، بەئاشكرا میكـانیزمێكی چارەسـەركردنی ئـاڵۆزی تێـدا دارێـژراوە: بەمەبەستی سەختكرنی لابردنی شوێنەواری سیاسەتی فاشیستانەی ڕژێمـی بـەعس، بەگرێـدانی چارەسـەرییەكە بـە مـەرجی ڕێكـەوتنی تێكـڕای ئەنـدامانی دەسـتەی

سەرکردایەتی کۆمار —واتە سەرکۆمار و هەردوو جێگرەکەی لەسەر پێشنیارێك یان حەکەمێك —یان بەنێودەوڵەتی (تدويل) کردنی مەسەلەکە!

- لە بڕگەی (ج) ی ماددەی (٥٨) باس لە دواخستنی چارەسەرکردنی کۆتایی ئەو "ئەردانەی کێشەیان لەسەرە بە کەرکووکەوە" تا پاش جێبەجێکردنی هەنگاوەکانی سەرەوەی ئاسایی کردنەوە و سەرژمێرییەکی دادپەروەرانە و روون و تا پاش پەسەندکردنی دەستوور دەکرێت. هەروەها جەخت لەسەر چارەسەرکردنی مەسەلەکە بە شێوەیەك دەکرێتەوە، کە لەگەڵ بیروباوەڕی دادپەروەریی بگونجێت، بەرەچاوکردنی ویستی دانیشتووانی ئەو ناوچانە: واتە ئاشکرایە ئەگەری نەگەڕانەوەی ئەو شوێنانەی کوردستان کە ئێستا زۆربەی دانیشتووانی کورد نین بۆ چوارچێوەی هەرێمی فیدڕاڵی کوردستان وەك: بەدرە و جەسان و زرباتیە و جەلەولا و سەعدیە و شارەبان و تێلتاوە و بەلەدرۆز و زمار ... ڕوون و ئاشکرایە، ئەگەر پرسیاری ئاراستەکراو لە ڕاپرسیی پێوەست بێت بە هاتنە ناو هەرێمی کوردستان.

- وادیارە (لێکدەدرێتەوە) کەوا دەستنیشانکردنی سێ قۆناخ لە بڕگەی دووەمی ماددەی (١٤٠) بۆ جێبەجێکردنی ماددەی (٥٨) —ئاساییکردنەوە و سەرژمێریی و ڕاپرسیی - لەبەر ڕۆشنایی ناوەڕۆکی بڕگەی (ج) ی ماددەی : (٥٨) میکانیزمی ئاڵۆزی جێبەجێکردنی بڕگەی (ب) ی ماددەی (٥٨) چاك دەکات و لەهەمان کاتدا بەرەچاوکرنی بڕگەی (ج) ی ماددەی (٥٨) سازش دەکرێت: لەسەر پێداگرتن لەسەر دیارکردنی سنووری هەرێمی کوردستان بە گوێرەی بەڵگەی مێژوویی و جوگرافی و سەرژمێریی کۆن (١٩٤٧ و ١٩٥٧)، چونکە نە لەبڕگەی (ج) ی ماددەی (٥٨) ی یاسای کاتی و نە لە ماددەی (١١٧) و نە لە ماددەی (١٤٠) ی دەستووری

هەمیشەیی باس لەم مەسەلەیە دەکرێت. تەنیا پێـوەری نـاوهێنراو لـە بڕگـەی (ج): لەبەرچاوگرتنی ویستی دانیشتووانە، لەبارەی ئەردی "ئەو شوێنانەی کێشەیان لەسـەر هەیە بە کەرکووکەوە"، پاش ئەنجامـدانی ئاسـاییکردنەوە و سـەرژمێریی. هـەروەها بێجگە لە کەرکووك ناوی شوێنەکانی دیکە نەهاتووە کە "کێشەیان لەسەر هەیـە" - هەرچەندە بەشێکی ئەم کێشەیە ئاکامی بەزۆرلکاندنی کوردستانی باشورە بە دەوڵەتی عێراق و بەشی دووەمیشی حکومەتی بەعس بە ستەمی ئاشـکرا دژی گـەلی کـورد دروستی کردووە و سەیرە کەکراوەتە کێشە لە نێوان گەلی کورد و لایەنێکی دیکە لـە عێراقی نویٚ! چونکە لە بواری یاساییەوە سازشە و ڕازیبوونـە بـە شـێواز و ئـەنجامی چارەسەرکرنی یاسایی کێشەی دانپێهێنـراو لـە نێـوان دوو لایـەن. هـەروەها جـۆری پرسیارەکەش، کە لە ڕاپرسیدا ئاڕاستەی خەڵکی دەکرێت، بە ڕوونی دیارنەکراوە.

لەگەل ئەمانەش هێشتا هەندێك تەگەرە لەسەر ڕێگەی جێبـەجێکردنی مـاددەی (١٤٠) لە ماوەی دیاریکراوی خۆیدا هەن، چـەند گرووپێکـی نـاوەکی و دەرەکـی — کۆنە بەعسی و داردەستانی وڵاتـە دابەشـکەرەکانی کوردسـتان لـە نـاو ئەنجومـەنی نوێنەرانی عێراق، هەروەها تورکیا و وڵاتە عەرەبییە سونییەکان و دەسـتەی بێکـەر- هاملتۆن یان "گرووپی لێکۆڵینـەوەی عێـراق" (Iraq Study Group) و"گرووپـی تەنگژەی نێودەوڵەتی" (International Crisis Group) - بـەبیانووی جۆراوجـۆر و نارەوا داوای دواخستنی ماوەی جێبەجێکردنی یان هەموارکردنی یان گۆڕینی ماددەی (١٤٠) دەکەن.

هەرچەندە سـەرکردایەتی سیاسـی کـورد و حکومـەت و پەرلـەمانی هـەرێمی کوردستان سوورن لەسەر جێبەجێکردنی ماددەکە لە ماوەی دیاریکراوی خۆی دا: واتە

تا کۆتـایی مـانگی دیسـەمبەری ۲۰۰۷، و چـەند لیژنەیـەکیان بـۆ بەدواداچـوونی جێبەجێکردنی ماددەکە پێکهێناوە. بەڵام لەبەر ئەو کۆسپ و تەگەرانەی لـە واقیعـدا هەن و چونکە جێبەجێکردنی تەواوی ماددەی (١٤٠) بەندە بە: ئەنجامدانی لـە سـێ قۆناخ (ئاساییکردنەوە و سەرژمێریی و ڕاپرسـیی)، لـە سـەر بنـەڕەتی خشـتەیەکی زەمەنی دیاریکراو بۆ هەر قۆناخێك، لە چوارچێوەی ماوەی دیـاریکراودا لـە بڕگـەی دووەمی ماددەکـە –واتـە تـا کۆتـایی سـاڵی ۲۰۰۷ چـونکە مـاوەی دانـراو بـۆ جێبەجێکردنی قۆناخی یەکەم( ئاساییکردنەوە) لە خشـتەی زەمـەنی جێبـەجێکردنی ماددەکە لە بەرنامەی حکومەتی هەڵبژێردراوی ئیئتیلافی عێراق لە کۆتـایی مـانگی حوزەیرانی ۲۰۰۷ بەسەرچوو، بەڵام هێشتا خاڵەکانی ۱ و ۲ و ۳ ی بڕگەی یەکەمی ماددەی (٥٨) بەتەواوی جێبەجێنەکراون و بڕگەی (ب)، کە بـە ڕای مـن گـرنگترین بڕگەی ماددەکەیە (لەبەر زۆر هۆی گرنگ) و بریتییـە لـە گەڕانـەوەی قـەزا و ناحیـە دابڕاوەکان لە پارێزگاکانی کەرکووك و هەولێر و دهۆك، دەبوایە تـا کۆتـایی مـانگی ئاداری ۲۰۰۷ ئەنجامبدرێت، جێبەجێنەکرا. هـەروەها هـیچ ئامادەکارییـەکیش بـۆ ئەنجامدانی قۆناخی دووەم( سەرژمێریی )، کە دەبێت تـا کۆتـایی ئـەیلوولی ۲۰۰۷ جێبەجێبکرێت، لە ئارادا نییە. بۆیە دەبێت سەرکردایەتی سیاسی کورد بە شێوەیەکی واقیعی و شێوازێکی دیار لەتەك پێداگرتنی لەسەر جێبەجێکردنی ماددەکە لە کـاتی دیاریکراوی خۆیدا، هەنگاوی پێویستیش دەستنیشان بکات بـۆ: خۆئامـادەکردن بـۆ ئەگـەری دواکـەوتنی جێبـەجێکردنی تـەواوی چـەند خـاڵێکی قۆنـاخی یەکـەم (ئاساییکردنەوە) لەگەڵ قۆناخی دووەم (سەرژمێریی) و قۆناخی سـێیەم (ڕاپرسـیی)، یان چەند خاڵێکی قۆناخی یەکەم لەگەڵ قۆنـاخی سـێیەم، واتـە خـۆ چـونکە ئەگـەر

پلانێــك، یــان ڕێكــەوتنێك لەســەر جێبــەجێكردنی پاشمــاوەی قۆنــاخی یەكــەم (ئاســاییكردنەوە) نــەبێت (كــەماوەی دیــاریكراوی تــەواوبووە)، و قۆنــاخی دووەم (سەرژمێریی) لە مانگی تەمووز دەستی پێنەكرد و ڕەنگە لەكاتی دیاریكراوی خۆیــدا (واتە تا كۆتایی مانگی ئەیلوول) تەواونەبێت. لەو حاڵەتەدا، لەوانەیە كاتی پێویســت بۆ ئەنجامدانی قۆناخی سێیەم (ڕاپرسیی) تــا كۆتــایی مــانگی دێســەمبەری ٢٠٠٧ نەمێنێت، و ئاواش جێبەجێكردنی تەواوی ماددەكە دوادەكەوێت، ئەگەر ڕێكەوتنێك و پلانێك لەمبارەیەوە نەبن بۆ بەردەوامبوون لەسەر جێبەجێكردنی تــەواوی ماددەكــە پاش ماوەی دیاریكراو، واتە پاش كۆتایی ســاڵی ٢٠٠٧، ئــەوا مەســەلەكە ئــاڵۆزتر دەبێت و میكانیزم و خشتەی زەمەنی جێبەجێكردنی پاشمــاوەی ماددەكــەش ڕوون و یەكلاكەرەوە نابن.

لێرەدا من (وەك توێژەرێكی ئەكادیمی پسپۆر لە بواری دۆزی كورد) چەند خاڵێــك دەستنیشان دەكەم و داوا لەسەركردایەتی سیاسی كورد لە هەرێمی كوردستان دەكــەم كە بایەخی پێبدەن و – وەك وەڵامێــك بــۆ داوای (پــەیمانگا ی كوردســتان بــۆ پرســە سیاسیەكان لە هەولێر) بۆ هەڵسەنگاندنی با ڕودۆخەكە – ئاراستەی جەنابی ســەرۆكی هەرێمی كوردستان، ڕێزدار مەسعوود بارزانی دەكەم:

پێش باسكردنی سەرنج و پێشنیار بۆ هەردوو حاڵەت، دەبێت سێ تشت بەتەواوی روونبكرێنەوە: دامەزراندنی سەرۆكی نوێی لێژنەی جێبەجێكردنی ماددەكە بە زووترین كات، یەكلاكردنەوەی شیكردنەوەی میكانیزمی جێبــەجێكردنی هــەر ســێ قۆنــاخی ماددەكــە و جەختكردنــەوە لەســەر پابەنــدبوونی حكومــەتی عێراقــی فیــدراڵ بــە

خشتەیەکی زەمەنی دیاریکاوی ڕێککەوتوو لەسەری لە نێوان سەرکردایەتی هەرێمی کوردستان و سەرۆکایەتی حکومەتی عێراقی فیدراڵدا.

حاڵەتی یەکەم - لەپێناوی جێبەجێکردنی تەواوی ماددەکە لە ماوەی دیاریکراو دا:

أ- بۆ ئەوەی ماددەکە بە شێوەیەکی گشتی لەماوەی دیاریکراوی خۆیدا، واتە تا کۆتایی ساڵی ۲۰۰۷ جێبەجێ بکرێت، دەبێت قۆناخی دووەم (سەرژمێریی) بەلای کەم لەسەرەتای مانگی ئەیلوولی ۲۰۰۷ دەستپێبکات و لە کۆتایی مانگی ئۆکتۆبەری ۲۰۰۷ تەواوبێت. هەرچەندە لەپێناوی دەستپێکردنی جێبەجێکردنی قۆناخی دووەمی ماددەی ۱٤۰ (سەرژمێریی) دەبێت مەسەلەی جێبەجێنەکردنی تەواوی حاڵەکانی ۱ و ۲ و ۳ ی بڕگەی یەکەمی ماددەی (۵۸) —واتە قۆناخی یەکەم (ئاساییکردنەوە) —نەبێتە بیانوو، یان تەگەرە لەسەر ڕێگەی ئامادەکاریی و دەستپێکردن بە جێبەجێکردنی قۆناخی دووەم (سەرژمێریی)، بەڵام دەبێت پێش دەستپێکردنی سەرژمێریی بڕگەی (ب) ی ماددەی (۵۸) جێبەجێبکرێت، واتە پێش ئەنجامدانی سەرژمێریی قەزا و ناحیەکان بگەڕێنەوە ناو سنووری پارێزگاکان. (ئەگینا پارێزگای کەرکوک - بۆ نموونە- بە پارچەپارچەکراوی دەمێنێتەوە و ڕێژەی دانیشتووانی کوردیشی لە قەوارەی کەرکوکی بچووککراووە لەلایەن ڕژێمی بەعس بەکەمکراوەیی دەمێنێتەوە و ئاکامی سەرژمێری دروست نابێت، بەڵکو سلبی دەبێت بۆ کورد و کوردستان، چونکە مەسەلەکە مەسەلەی گشت پارێزگای کەرکوکە، نەك تەنیا شاری کەرکووك).

ب- دەبێت قۆناخی سێیەم (ڕاپرسیی) لە سەرەتای نۆڤەمبەر یـان دێسـەمبەری ٢٠٠٧ دەست پێ بکات، و لە کۆتـایی دێسـەمبەری ٢٠٠٧ جێبـەجێکردنی ئـەم قۆناخە ومادەدەی (١٤٠) بە گشتی تـەواوبێت. پاشمـاوەی خاڵـەکانی بڕگـەی یـەکی ماددەی (٥٨)یش —ئەگەر تا ئەو کاتەش جێبەجێنەکران، دەبێت لەساڵی داهـاتوو و لەماوەیەکی گونجاو و ڕێکەوتوو لەسەری جێبەجێبکرێت.

حاڵەتی دووەم - بۆ ئەگەری جێبەجێنـەکردنی هەرسـێ قۆنـاخی ماددەکـە لـە ماوەی دیاریکراو دا:

أ- ئەگـەر خاڵـەکانی بڕگـەی یەکـەمی مـاددەی (٥٨) —واتـە قۆنـاخی ئاسـاییکردنەوە -تـا کۆتـایی مـانگی تـەمووز، یـان ئـابی ٢٠٠٧ بەتـەواوی جێبەجێنەکران، یا لە ماوەی دیاریکراو بۆ جێبەجێکردنی گشت ماددەکە - واتـە تـا کۆتایی دێسەمبەری ٢٠٠٧ - بەلای کەم ئەم کارانەی خوارەوە لە بڕگەی یەکەم ئەنجام بدرێن و ئەوانی دیکەش پاشان بە پێی ڕێکەوتنێك لە نێـوان سـەرکردایەتی سیاسـی کورد و لایەنی عێراقی بەرپرس لەسەر ماوەیەکی دیاریکراوی دی لـە سـاڵی ٢٠٠٨ تەواو بکرێن:

١- لە چوارچێوەی جێبەجێکردنی خـاڵی یەکـەمی بڕگـەی یەکـەمی مـاددەی (٥٨)، ئاوارە گەڕاوەکان بۆ شار و گونـدەکانی خۆیـان —بـە تایبـەتی لـە پارێزگـای کەرکووك و قەزای شەنگال و ناحیەی مەندەلی —تاکۆتایی ئەمساڵ نیشتەجێ بکرێن یان ئەرز و کۆمەکی داراییان بۆ ئەم مەبەستە پێبدرێت.

٢- چوارچێوەی جێبەجێکردنی خاڵی دووەمی بڕگەی یەکـەمی مـاددەی (٥٨)، ئەو دانیشتووانە عەرەبە نامۆ هاوردانە و نیشتەجێکراوانەی ئارەزوومەندانە تا کۆتایی

ئەمساڵ دەگەڕێنەوە و قەرەبوودەکرێنەوە، یەکسەر کارتی تەموین و تۆمار (سجل) ی نفوسیشیان لەگەڵدا بگوازرێنەوە ئەو شوێنانەی پێشویان کە لێیان هاتوونە و بۆیان دەگەڕێنەوە.

٣- لە چوارچێوەی جێبەجێکردنی خاڵی سێیەمی برگەی یەکەمی ماددەی (٥٨)، ئەو کەسانەی کاریان لەدەستداوە لە ئەنجامی دەربەدەربوونیان بەتایبەتی لە کەرکووك و ئێستاکە بەتەمەنن یان نەماون، وەك بەدیلێکی واقیعی کەسانی نزیکی وان و بەتوانا بەرەبەرە و بەپێی پلانێکی گونجاو لە کۆمپانیای نەفت —کە تا ئێستاش ژمارەیەکی یەکجار کەم کارمەندی کورد تێیدا کاردەکەن - دابمەزرێن.

ب- لە هەموو حاڵەتێکدا دەبێت برگەی (ب) ماددەی (٥٨)، کەماوەی جێبەجێکردنی لە کۆتایی مانگی ئادار بەسەرچووە، لە ساڵی٢٠٠٧ دا جێبەجێ بکرێت، واچاکە ئەم برگە زۆرگرنگە تا کۆتایی مانگی ئەیلوولی ٢٠٠٧ جێبەجێبکرێت. دەبێت کۆتایی بە لەت لەتکردن و دابەشکردنی پارێزگای کەرکووك لە ساڵی ١٩٧٦ و دابڕینی قەزایەکی پارێزگای دهۆك لە ساڵی ١٩٧٥، و دابڕینی قەزایەکی پارێزگای هەولێر لە ساڵی ١٩٩١ لە لایەن ڕژێمی پێشوی بەعس بهێنرێت. واتە دەبێت قەزاکانی دوزخورماتوو و کفری و چەمچەماڵ و کەلار و ناحیەکانی پردێ و شوان و قەرەهەنجیر و سەرگەران و هەموو گوندە وێرانکراوەکانیان بەفەرمی و واقیعی بگەڕێنەوە ناو سنووری ئیداری پارێزگای کەرکووك وەك ساڵی ١٩٦٨. هەروەها دەبێت قەزای مەخموور بەفەرمی و واقیعی بگەڕێتەوە ناو سنووری ئیداری پارێزگای هەولێر وەك ساڵی ١٩٩٠، و قەزای ئاکرێ بەفەرمی بگەڕێتەوە ناو سنووری ئیداری پارێزگای دهۆك وەك ساڵی ١٩٧٤. لەم حاڵەتە دا هەرێمی کوردستانی دانپێهێنراو لە

دەستوور فراوانتردەبێت و دەكرێت دەست بە بنیاتنانی پاڵاوگەیەكی نەوتی مـەزن لـە مەخموور بكرێت. هەروەها ئەگەر سەرژمێریی و ڕاپرسییش دواكـەوتن یـان ڕاپرسـیی دواكەوت بۆ پاش ساڵی ۲۰۰۷، ئەنجامی دواكەوتنەكە لەم حاڵەتەدا بۆ گەلی كورد لە پارێزگای كەركووك سلبی نابێت، بەڵكو ئەو كاتەش هـەر ئیجـابی دەبێـت، چـونكە ئەگەر سەرژمێریی دانیشتووان پاش گەڕانەوەی قەزاو ناحیەكان بۆ سنووری پارێزگـای كەركووكی ئەسلی رووبدات، ئەوا پتر لە ۷۰٪ ی دانیشـتووان كـوردن. بۆیـە نابێـت جێبەجێكردنی ئەم بڕگەیە بە هیچ شێوەیەك بۆ پاش ساڵی ۲۰۰۷ دوابخرێت.

ج - ئەگـەر چـەند خـاڵێكی بڕگـەی یەكـەمی مـاددەی (٥٨) بەتـەواوی و قۆناخەكانی دووەم (سەرژمێریی) و سێیەم (ڕاپرسـیی)، یـان چـەند خـاڵێكی بڕگـەی یەكەمی ماددەی (٥٨) بەتەواوی و قۆناخی سێیەم (ڕاپرسیی) - لەبەر هـەر هۆیـەك بێت ئـەنجام نـەدران، واتـە دواخـران — دەبێـت ڕێكـەوتنێك سـازبكرێت لـە نێـوان سەركردایەتی سیاسی كورد و لایەنی عێراقی بەرپرس بۆ دەستنیشانكردنی میكانیزم و نەخشەی زەمەنی پێویست بۆ تەواوكردنی جێبەجێكردنی ماددەی ۱٤۰.

د - پێویستە كەسانی ڕاسـپێردراو بـۆ بەدواداچـوونی جێبـەجێكردنی مـاددەی (۱٤۰) شارەزا و بەتوانا و ئازا بـن. دەبێـت زانیـاری دروسـتی یاسـایی و زانسـتی سیاسەت و مێژوویی و جوگرافی و سەرژمێریی و شارەزایی هونەری دیالۆگیان هەبێت و بەلای كەم زمانی عەرەبیش چاك بزانن. ژمارەیان گرنگ نییە، گرنگ ئەوەیە كارا و لێهاتوو و پاك بن، واتە بەڕاستی شیاوی ئەنجامدانی ئەم ئەركە سەختە و لـە ئاسـتی پێویستی ئەم بەرپرسیارییە گەورەیە بن.

بەرلین — ۲۰۰۷\۷\۲٥

## بەرپرسیی مێژوویی دەستەی سەرۆکایەتی کۆمار لەبارەی جێبەجێکردنی جەوهەری ماددەی ١٤٠ لە ماوەی درێژکراودا

هــەردوو حکومــەتی کــاتی (عــەلاوی) و گواســتنەوەی (جەعفــەری) جێبەجیکردنی ماددەی (٥٨)ی یاسای ئیدارەی دەوڵەتی عێراق بۆ قۆناخی گواستنەوە پشتگوێخست، ئەمەش نەك تـەنیا کەموکورتییـەکی بەرچـاوی کاری هەردوو حکومەتـە، بـەڵکو پەکخسـتنێکی مەبەسـتداری گـرنگترین مــاددەی یاسـای کـاتی و سەرپێچییەکی ئاشـکرای بەرنامــە و کۆششـی سڕینەوەی ئاسەواری سیاسـەتی ڕەگەزپەسـتانە و تایفەگەرییانـەی ڕژێمـی بەعسە: لەبواری تەعریبی خـاکی چـەندین ناوچـەی دابـڕاوی کوردسـتان و پاکتاوی نەژادی دانیشـتووانی رەسـەنییان، بەتایبـەتی پارچەپارچـەکردنی پارێزگای کەرکوك و دابڕین ودابەشکردنی چوار قەزا و تیکدانی ٣ ناحیـە و سـەدان گونـدی کوردنشـینی پارێزگاکـە. هـەروەها چاوپۆشینیشـە لـە ڕاستکردنەوەی سنووری ئیـداری شـێواوی هەنـدێك ناوچـەی شیعەنشـینی ناوەڕاستی عێراقیش- بەتایبەتی لە کەربەلا و بەغداد.

گــرنگترین بەشــی مــاددەی (٥٨) بڕگــەی (ب)ی ماددەکەیــە، کــە پەیوەستە بە گۆڕینی سنووری ئیداری لەلایـەن ڕژێمـی پێشـوو و بـاس لـە شێوازی چاککردنەوەی دەکات. ئەم بڕگەیـە دواتـر بـووە کـاکڵی مـاددەی

(١٤٠)ی دەستووری هەمیشەیی عێراق. لەم بڕگەیەدا بە ئاشکرا شێواندنی ناهەمواری سنووری ئیداری و "شتی دیکەی" چەندین ناوچە لە لایەن ڕژێمی پێشوو "بەمەبەستی سیاسی" دەستنیشانکراوە، بەڵام بۆ چاککردنەوەی ئاسەواری ئەم کردارە ناڕەوایەی ڕژێمی بەعس میکانیزمێکی یەکجار ئاڵۆز و ناڕەوا — لەلایەن نوێنەری عەرەبی سوننی — هەر لەنیو ئەم بڕگەدا چەسپیندراوە، جێگەی سەرسوڕمانە کە کاتی خۆی نوێنەرانی کورد ئەمەیان پەسەندکردووە! لە جیاتی ئەوەی میکانیزمێکی دروست و ڕەوا - بێ پەنا وپێچ — بچەسپێندرێت، واتە بریتی بێت لە: ڕەتکردنەوەی ئەو بڕیارە ڕەگەزپەرستانە و تایفەگەرییانەی "ئەنجومەنی سەرکردایەتی کودەتای بەعس"، کە بوونەتە هۆی ئەم گۆڕینە ناڕەوایانەی لەسەرەتای بڕگەکە باسیان لێوەدەکرێت و بوونەتە مایەی ستەم و ئازاریکی زۆر.

بەهەرحاڵ بە پێی ئەم میکانیزمە ئاڵۆزە: دەبوایە ئەنجومەنی سەرۆکایەتی کۆمار و حکومەتی گواستنەوە ئامۆژگاری لەبارەی چاککردنەوەی سنوورە شێواوەکان پێشکێش بە "کۆمەڵەی نیشتمانی" بکەن" بەڵام ئەگەر هەر سێ ئەندامی سەرۆکایەتی کۆمار (سەرکۆمار و هەردوو جێگرەکەی) نەیانتوانیبوایە تێکڕا لەسەرئامۆژگارییەکان ڕێکبکەون دەبوایە پێکەوە لەسەر ناوبژیکار(حەکەم)ێك ڕێکبکەون" ئەگەر ئەوەش نەکرابوا دەبوایە داوا لە سکرتێری نەتەوەیەکگرتووەکان بکەن کەوا ئەو ناوبژیکارێکی نێودەوڵەتی لێهاتوو بۆ مەسەلەی ناوبژیکردنەکە

دەستنیشـــان بکـــات. ئـــەم هـــەنگاوە گـــرنگ و پێویســـتە کـــاتی خـــۆی (لەسەردەمی حکومەتی گواستنەوە) دا نەهاوێشترا! بۆچی؟ هۆکارەکـانی دیارنیین.

هەرچـــەندە حکومـــەتی ڕێـــزدار نـــووری مـــالیکی — کـــە هاوپـــەیمانی کوردســـتانی بەشـــێکی گرنگیـــەتی — هەنـــدێك هـــەنگاوی ســـەرەتایی بـــۆ جێبەجێکردنی ماددەکە هاوێشتووە، بەڵام کەمتەرخەمییەکی دیاری نوانـد لە بارەی پابەندبوون بە بەرنامەی کاری هاوبەشـی حکومـەتی ئیئتـیلافی و سەرپێچییەکی بەرچاوی دەستووری هەمیشەیی پەسەندکراوی عێراقی کرد، بە تەواونـەکردنی جێبـەجێکردنی مـاددەی (١٤٠)ی دەسـتوور لـە کـاتی دیاریکراوی خۆیدا (واتە تاکۆتایی ساڵی ٢٠٠٧).

پێش کۆتایی هـاتنی مـاوەی دیـاریکراو بـۆ جێبـەجێکردنی مـاددەی (١٤٠) دەبوایە لایەنی پێوەندیدار (واتە بەرژەوەندیدار) لە جێبـەجێکردنی ماددەکـە، یاداشـتێکیان ئاراسـتەی دادگـەی فیـدراڵی عێـراق کردبوایـە، لـەپێناوی ڕوونکردنـەوەی هۆکارەکـانی تەواونـەبوونی جێبـەجێکردنـی ماددەکـە لـە وادەی دیـاریکراوی خۆیـدا و دەستنیشـانکردنی لایەنـە بەرپرسەکان لەم مەسەلە دەستوورییە گرنگە و بۆ پابەنـدکردنی حکومـەتی عێراقـی بـە جێبـەجێکردنی تـەواوی مـاددەی (١٤٠) بـە پێـی ڕەوایـی دەستووری و هێزی یاسایی ماددەکە لە زووترین کـات لـە سـاڵی ٢٠٠٨، هەرچـەندە مـەفعول و ڕەوایـی ماددەکـە بەنـدە بـە مـەفعول و ڕەوایـی دەستووری هەمیشـەیی پەسـەندکراو لەلایـەن زۆربـەی زۆری دەنگـدەرانی

عێراق، لەگەڵ ئەمەش داواکردنەکە پێویست بوو لە پێناوی دریژکردنــەوەی ماوەی جێبەجێکردنی ماددەکە بەشێوەیەکی یاسایی روون و بۆ رێگــەگرتن لە نەیارانی ماددەکە لە تەگەرە دروستکردن بە بیانوی تــەواوبوونی وادەی دیاریکراوی جێبەجێکردنی.

بەهەرحاڵ چاك بوو کە نەتەوەیەکگرتووەکان دەستپێشخەرییەکی باشــی لــەم بارەیــەوە کــرد- لــەباتی لایەنــە پێوەنــددارەکان —، کــە داوای درێژکردنەوەی وادەی تــەواوکردنی جێبــەجێکردنی ماددەکــەی بــۆ مــاوەی شەش مانگ کرد و مەجالی شیکردنەوەی سلبی مەسەلەکەی لــە ناحــەزان بڕی. بەڵام بۆ ئەوەی: بەلای کەم لەم شــەش مــانگی داهــاتوو دا گــرنگترین بەشی ماددەکە جێبەجێ بکریــت — ئەگــەر هەمووشــی جێبەجێنــەکرێت ، دەبێت ســەرۆکایەتی کۆمــار ئــەرکی سەرشــانی خــۆی لــەم بارەیــەوە لــەم ماوەیەی درێژکراوەدا بە پێی برگەی (ب)ی ماددەی (٥٨) بەجێبگەیەنێت. ئەم ئەرکە گەورە و بەرپرسییە مێژووییــەش بریتییــە: لــە پێشکێشــکردنی ئامۆژگاری - یان بڕیارێك - بە تێکڕایی (لەلایــەن ســەرکۆمار و هــەردوو جێگرەکەی) بۆ چاککردنەوەی سنوورە ئیدارییە شیواوەکان لــە ســەر دەمــی ڕژێمی بەعس، کە خۆی لە ڕەتکردنەوەی بریارە ناڕەواکانی رژیم ســەبارەت بە شێواندنەکە دەنوێنێت، بۆ ئەوەی کاکلی مــاددەی (٥٨) یاســای کــاتی، واتە کاکلی مــاددەی (١٤٠)ی دەســتووری هەمیشــەیی عێــراق جێبــەجێ بکریت: کە دەبێتە هــۆی چــاککردنەوەی ســنوورە ئیدارییــە ڕەســەنەکانی پارێزگاکان بەر لە شێواندنیان لە لایەن رژێمی بــەعس لــە پــاش کودەتــای

دووەمیان لەساڵی١٩٦٨" واتە دەبێتە هۆی گەڕانەوەی هەرچوار قەزای بەزۆر دابڕێندراو لە پارێزگای کەرکووك (چەمچەماڵ. کەلار،کفری،دوزخورماتوو) و قەزای مەخمووری بەزۆر دابڕێندراو لە پارێزگای هەولێر و قەزای ئاکرێی (بە ڕەسمی) دابڕێندراو لە پارێزگای دهۆك،دەبێتە هۆی دابەشکردنێکی ڕەوای بادییەی شیمالیش لەنێوان هەردوو پارێزگای ئەنبار وکەربەلا ... .

ئەگەر ئەم مەسەلەیە گرنگە لەم شەش مانگی درێژکردنەوەیەدا یەکلابووەوە، ئەوا جەوهەری ماددەی (١٤٠) جێبەجێدەبێت و پاشماوەکەشی دەتوانریت لە ساڵی ٢٠٠٨ تەواو بکرێت. لەم حاڵەتەدا ئاکامی سەرژمێری و ڕاپرسی – ئەگەر پاش ئەم شەش مانگەش بێت - ئیجابی دەبێت. بەڵام ئەگەر سەرۆکایەتی کۆمار نەیتوانی ئەرك و بەرپرسی دەستنیشانکراوی خۆی لە ماددەی (٥٨) لەم ماوەیەش جێبەجی بکات، ئەوا گرنگترین بەشی مادەکە دیسان جێبەجیٚ ناکریت و مەسەلەی جێبەجێکرنی تەواوی ماددەکە زۆر ئاڵۆزتر دەبێت.

جا بۆئەوەی پرۆسەی جێبەجێکردنی ماددەی (١٤٠) بە ڕێبازیکی واقیعیدا تێپەڕێت، پێویستە سەرۆکایەتی کۆماری عێراق – لە پێش هەموویانەوە سەرکۆمار ڕێزدار جەلال تالەبانی کۆششێکی بێوچان و بێهاوتا لەم مەیدانەدا بکات، تاوەکو ئەم جارەیان بتوانن: یان بڕیارێکی هاوبەشی دادپەروەرانە لە بارەی مەسەلەی چاککردنەوەی سنوورە شێواوەکان لەسەردەمی بەعس هەروەك لێژنەی جێبەجێکردنی ماددەکە

داوایکردووە - بە تێکڕایی بدەن، یان ئامۆژکارییەکی دروست و گونجاو لەم بارەیەوە پێکەوە پێشکێش بکەن. ئەم کارە ئەرکێکی پیرۆز و بەرپرسییەکی مێژوویی سەرۆکایەتی کۆمارە، پێویستە لە ماوەی درێژکراوی ئێستادا ئەنجام بدرێت، بۆ ئەوەی جەوهەری پرۆسەی جێبەجێکردنی ماددەی (١٤٠)، واتە بناغەی جێبەجێکردنی تەواوی ماددەکە، لەم شەش مانگەی درێژکراوەدا مسۆگەر بکرێت. ئەگەرنا ئەم شەش مانگە درێژکراوەش دەچێتە پاڵ دوو ساڵی ڕابردوو، شەش مانگی دیکەش درێژدەکرێتەوە و کۆششی کورد بۆ جێبەجیکردنی ماددەکە لە شەش مانگی درێژکراوی دیکەشدا وەك دواکەوتن بەدوای سەرابی لێدێت.

بەڵام ئەگەر لەم شەش مانگە درێژکراوەی ئێستادا بڕگەی (ب)ی ماددەی (٥٨) بە هۆی کۆششی سەرۆکایەتی کۆمار جێبەجیکرا، واتە ئەگەر سنووری شێواوی پارێزگاکانی کەرکووك و هەولێر و دهۆك و کەربەلا لەلایەن رژێمی بەعس چاککرانەوە، و قەزا و ناحیە دابڕاوەکان لەم ماوەیەدا گەڕاندرانەوە نێو سنووری پارێزگا پارچەکراوەکانی کوردستان، ئەوا جێبەجێکردنی ماددەی (١٤٠) لە ساڵی ٢٠٠٨ مسۆگەر دەبیت.

## دەور و ئەرکی  دیمستۆرا لە چوارچێوەی ماددەی (١٤٠)

پـــاش ئـــەوەی وادەی جێبـــەجێکردنی مـــاددەی (١٤٠)ی دەســـتووری هەمیشەیی عێراق لە کۆتایی ساڵی ٢٠٠٧ تەواو بـوو، بـێ ئـەوەی نـاوەرۆکی ماددەکە بەتەواوی جێبەجێ بکرێت، واتە بێ ئەوەی گۆڕانە ناڕەواکانی سـنووره ئیدارییـەکانی پارێزگاکـانی کوردسـتان بەفـەرمی و بەشـێوەیەکی دەسـتووری چاکبکرێنەوە، کە بریتیین لە: دابڕاندنی قەزاکانی ئاکرێ (تا ئێستاش بەفـەرمی هەر سەر بە پارێزگـای موسـلە) و مـەخموور و دوزخۆرمـاتوو و چەمچـەماڵ و کەلار و کفری (تا ئێستاش بەفـەرمی هـەر سـەر بـە پارێزگـای دیالەیـە)، لـە پارێزگاکانی دهـۆك و کـەرکووك و هـەولێر و(بەشـێوەیەکی فـەرمی و نـاڕەوا) لکاندنیان بە پارێزگا عەرەبە سـوننی نشـینەکانی موسـڵ و تکریـت و دیالـە. هەروەها لکانـدنی تـەواوی بادیـەی شـیمالی بـە پارێزگـای عـەرەبی سـوننی ئـەنبار(لەناوچـەی عـەرەبی شـیعە)، هەرچـەندە بەشـی گـەورەی بەرانبـەر و درێژکراوەی پارێزگای کەربەلایە، و بێ ئـەوەی ئاسـەواری سیاسـەت و کـردەوە ڕەگەزپەرستە کـانی ڕژێمـی بـەعس بەتایبـەتی دژی گـەلی کـورد (تـەعریب و ئەنفال) لەو ناوچـانەی تـا ئێسـتا لـە کوردسـتان دابڕینـدراون و جـاران لـەژێر دەسەڵاتی بەعس دابوون و ئێستا لە ژێر کۆنترۆڵی حکومەتی ناوەنـدی بەغـداد دان، بەتەواوی بسرێتەوە.

جگە لە چارەسەرکردنی ئـەم گرفتـە، چارەسـەرکردنی گرفتێکـی دیکـەش کەوتووەتـە چوارچـێوەی مـاددەی (١٤٠): ئـەویش گـرفتی دابڕانـی پێشـانی خانەقین و مەندەلی و بـەدرە و جەسـان و شـەنگال و شـێخان ... لـە لیوا،یـان پارێزگاکانی کوردستان، کە لەگەڵ سـتەمی پارچەپارچـەکردن و بچـووکردنەوە و دابەشـکردنی پارێزگـای کـەرکوك بـووەتـە گرفتێـك بـە نـاوی "ناوچـە کێشەدارەکان" (المنـاطق المتنازع عليها). بەم شێوەیە مـاددەی (١٤٠) بووەتـە پێوەری یەکلاکردنەوەی سنووری ئیداری هـەرێمی فیـدراڵی کوردسـتان. لەگـەڵ ئەمەشدا دەزگە پێوەندیدارەکان لەلایەنی کوردی، بەتایبەتی لە هەردوو لێژنـەی بەدواداچوونەوەی جێبـەجێکردنی مـاددەی (١٤٠) لـە ئەنجومـەنی نوێنـەرانی عێـراق و لـە پەرلـەمانی هـەرێمی کوردسـتان، نـە پـێش تـەواوبوونی وادەی دیاریکراوی جێبـەجێکردنی ماددەکـە و نـە پـاش تـەواوبوونی وادەکـە، هـێچ سکاڵایەکیان لەم بارەیەوە پێشکێشی دادگەی باڵای (فیـدرالی) عێـراق نـەکرد، بۆ روونکردنەوەی هۆ و بەرپرسـیی جێبەجێنـەکردنی ئـەم مـاددە دەسـتوورییە گرنگە لەلایەن حکومەتی ناوەندیی عێراق لـە وادەی دیاریکراویـدا، هەرچـەندە بە پێی دەسـتوور و بـەپێی بەرنامـەی کـاری هاوبەشـی حکومـەتی ئیئتـیلافی ناوەندیی پێویست بوو حکومەتی بەغداد پابەند بوایە بە جێبەجێکردنی تـەواوی ماددەکە لە وادەی دیاریکراویدا لـە دەسـتوور، یـان بـەلای کـەم هۆکارەکـانی تەواونەکردنی جێبەجێکردنی بۆ گەل بە وردی روونبکاتەوە و تکای لێبـوردن لـە گەل و داوای ماوەیەکی دیاریکراوی دیکە لـە ئەنجومـەنی نوێنـەرانی عێـراق و دەزگاکانی هـەرێمی کوردسـتان بکـات. هـەروەها دەزگـە پێوەندیـدارەکان لـە

لایەنی کوردی هیچ ئەلتەرنەتیڤ واتە بەدیلێکییان بۆ چارەسەرکردنی گرفتەکە ئامادەنەکرد، بەڵکو بەشێوەیەکی ناواقیعیانە لە مانگی ٢٠٠٧/١٢ یش تا دوارۆژی وادەکە سووربوون لەسەر جێبەجێکرنی ماددەکە لە وادەی دیاریکراوی خۆی دا! ئاواش، ئەگەر هەر هیچ نەکرابوا، مەسەلەکە ئالۆزتر دەبوو، ئەگەری تێکچوونی باری ئاسایش بە شێوەیەکی جیددی لەو ناوچانە دروست دەبوو. بۆیە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و نەتەوەیەکگرتووەکان بیریان لە ئەلتەرنەتیڤ - درێژکردنەوەی وادەی جێبەجێکردنی ماددەکە - کردەوە. (نووسەری ئەم گوتارە لە کۆبوونەوەیەکی تایبەتدا لەنێوان ٨ پسپۆڕ (لە بوارەکانی زانستەکانی سیاسەت و یاسا و جوگرافیا) و جێگری سەرۆکی پەرلەمانی کوردستان، لەسەرەتای مانگی دێسەمبەری ٢٠٠٧ دا — وەك مامۆستای وانەدەرەوەی ماددەی (١٤٠) لە کۆلێژی یاسا و ڕامیاری- گرنگیی پێشکێشکردنی سکاڵا بە دادگەی باڵای فیدرالی و ئامادەکردنی پلانێکی شیاو (وەك ئەلتەرنەتیڤ) بۆ حاڵەتی جێبەجێنەکردنی تەواوی ماددەکە لە وادەی دیاریکراودا روونکردەوە و لە یاداشتێکیش لەم بارەیەوە کە لە ڕۆژی ٢٠٠٧/١٢/١٦ ئاراستەی جێگری سەرۆکی پەرلەمان ڕیزدار کەمال کەرکووکی کرد جەختی لەسەر مەسەلەکە کردەوە. هەروەها لەسەر خواستی جەنابی سەرۆك وەزیرانی حکومەتی هەرێمی کوردستان ڕێزدار نێچیرڤان بارزانی لە چاوپێکەوتنێکی تایبەت لە کۆتایی مانگی کانوونی دووەمی ٢٠٠٨ دا، گرنگیی هەردوو مەسەلەی بۆ وەزیری کاروباری ناوچەکانی دەرەوەی هەرێم ڕێزدار محەمەد ئیحسان دووپاتکردەوە.

بەهەرحاڵ چەند رۆژێـك پـێش تـەواوبوونی وادەی جێبـەجێکردنی تـەواوی ماددەی (١٤٠)، وادەکە لەسەر پێشنیاری نوێنەرانی نەتەوەیـەکگرتووەکـان بـۆ پەرلەمانی کوردستان شەش مانگی دیکە واتە تا کۆتـایی مـانگی حـوزەیرانی ٢٠٠٨ درێژکرایـەوە. ئـەم کـردارەی (UN) بـە پێـی بڕیـاری (١٧٧٠)ی ئەنجومەنی ئاسایش گونجاوە: لە پێناوی چەسپاندنی ئاسایشە لە هـەموو هـەرێم و ناوچەکانی عێراقدا بەگشـتی و بـۆ پێشکێشـکردنی یارمەتییـە لـە پێنـاوی چارەسـەرکردنی گرفتـەکانی جێبـەجێکردنی نـاوەڕۆکی مـاددەی (١٤٠) بەتایبەتی.

هەرچەندە جگە لە تەگەرەی میکـانیزمی نـاکۆکی جێبـەجێکردنی بڕگـەی (ب)ی ماددەی (٥٨) واتە کاکڵی ماددەی (١٤٠) و جگە لـە پشتگوێخسـتنی جێبـەجێکردنی ماددەکـە لـە لایـەن هـەر ٣ حکومـەتی عێراقـی نـوێ، دژایەتیکردنی ئاشـکرای لایـەنی عـەرەبی سـوننی بـۆ نەهێشـتنی ئاسـەواری ستەمی بـەعس دژی خـاك و خـەڵکی کوردسـتان و دەسـتتێوەردانی دەوڵەتـە دابەشـکەرەکانی کوردسـتان (تورکیـا و ئـێران و سـوریا) و دەوڵەتـە عەرەبـە سوننییەکان دژی ناوەڕۆکی ماددەکـە، تەگـەرەی گـەورەیان دروسـتکردووە لـە پێش حکومەتی مالکی لەسەر ڕێگـەی تـەواوکردنی جێبـەجێکردنی مـاددەی (١٤٠)، بەڵام هەڵەکانی دەزگە پێوەندیدارەکانی لایـەنی کـوردییش، بەتایبـەتی هەڵەی پەسەندکردنی میکانیزمە نـاکۆك و ناڕەواکـەی بڕگـەی (ب)ی مـاددەی (٥٨) و پێشکێشـنەکردنی سـکاڵا بـۆ دادگـەی باڵـای فیـدرالی عێـراق بـۆ دەستنیشـانکردنی هـۆ و لایـەنی بـەرپرس لـە تەواونـەکردنی جێبـەجێکردنی

مادده‌كــه لــه واده‌ی دیــاریكراودا، دوو ته‌گــه‌ره‌ی ســه‌ربار و مایــه‌ی كه‌مته‌رخه‌می ده‌زگه پێوه‌ندیـداره‌كانی كـوردن. له‌به‌رئـه‌وه ده‌بێـت ده‌زگـه پێوه‌ندیداره‌كانی كورد ڕاشكاوانه دان به‌م ڕاسـتییه تاڵـه‌دا بنـێن و په‌نـدی لێوه‌ربگرن و تووشی هه‌ڵه‌ی سێیه‌م و كوشنده نه‌بن له‌م باره‌یه‌وه.

گـه‌وره‌ترین ته‌گـه‌ره له‌سـه‌ر ڕێگـه‌ی جێبـه‌جێكردنی مـادده‌ی (١٤٠) بریتییه له: میكـانیزمی ئـاڵۆز و نـاكۆكی جێبـه‌جێكردنی بڕگـه‌ی (ب)ی مادده‌ی (٥٨) له یاسای ئیـداره‌ی كـاتی په‌سـه‌ندكراو، كـه لـه مـادده‌ی (١٤٠)ی ده‌ســتووری هه‌میشــه‌یی عێــراقیش چه‌ســپاوه. بــه‌پێی ئــه‌م میكانیزمه: ئه‌گـه‌ر هه‌رسـێك ئه‌نـدامی ئه‌نجومـه‌نی سـه‌رۆكایه‌تی كۆمـار (سـه‌ركۆمار و هـه‌ردوو جێگره‌كـه‌ی) تێكـڕا له‌سـه‌ر ڕێنمـایی هاوبـه‌ش ڕێكنه‌كـه‌وتن، ده‌بێـت هه‌وڵبـده‌ن كـه‌وا پێكـه‌وه له‌سـه‌ر ناوبـژیكارێك (حه‌كـه‌مێك) ڕێكبكـه‌ون و ئه‌گــه‌ر هــه‌ر ســێكیان پێكــه‌وه له‌ســه‌ر ده‌ستنیێشـانكردنی ناوبـژیكارێكیش ڕێكنه‌كـه‌وتن، ئـه‌وا ده‌بێـت داوا لـه سكرتێری نه‌ته‌وه یـه‌كگرتووه‌كان بكـه‌ن، بـۆ ئـه‌وه‌ی ئـه‌و كه‌سـایه‌تییه‌كی نێوده‌وڵه‌تی گونجاو وه‌ك ناوبـژیكار بـۆ ئـه‌م مه‌به‌سـته دیاربكـات. لێـره‌دا (له‌ده‌ستوور) مافی ڕه‌تكردنه‌وه‌ی ڕاستكرنه‌وه‌ی گۆڕانـه ناڕه‌واكـانی بـه‌عس (ڤیتۆ) به شێوه‌یه‌كی سه‌یر به‌خشـراوه بـه نوێنـه‌ری عـه‌ره‌بی سـوننی لـه سه‌رۆكایه‌تی كۆمار (كه ئێستا ڕێزدار تارق هاشمی یه)، ئه‌ویش ئـه‌م مافـه (ده‌ستوورییه ناڕه‌وایه) بۆ ئه‌م مه‌به‌سته و به‌مه‌به‌ستی ڕه‌تكردنه‌وه‌ی ده‌یـان

یاسا و بڕیاری ئەنجومەنی نوێنەران کە لە بەرژەوەندی شۆڤینیستانەی عەرەبی سوننیدا نیین بەکاردەهینێت.

لەم دوواییانەدا سەرکۆمار ڕێزدار جەلال تالەبانی بەڕاشکاوی دانی بەمە دانا، کەوا دەستەی سەرۆکایەتی کۆمار ناتوانن پێکەوە بگەنە ڕێنمایی هاوبەش بۆ جێبەجێکردنی کاکلی ماددەکە (واتە برگەی ب)، بەپێی میکانیزمی جێبەجێکردنی ئەم برگەیەش، دەبێت لەم حاڵەتە داوا لە سکرتێری (UN) بکەن بۆ دەستنیشانکردنی ناوبژیکارێکی نێودەوڵەتی، چونکە ڕێزدار دیمستۆڕا نوێنەری دەستنیشانکراوی سکرتێری(UN)ە لە عێراق، لەبەرئەوەی دەستپێشخەری درێژکردنەوەی وادەی جێبەجێکردنی ماددەکەیە، بۆیە جاریَ ڕێزدار دیمستۆڕا ئەم کارە دەکات. و چونکە ڕێزدار دیمستۆڕا تەگەرە و هۆکارەکانی جێبەجێنەکردنی ماددەکەی بۆ روون بووەتەوە، بۆیە بیری لە پلانێکی ئەلتەرنەتیڤی تایبەت کردوەتەوە: لە پێناوی بەدیهێنانی شێوەیەکی تەوافوقی بۆ چارەسەرکرنی هەردوو گرفتە سەرەکییەکەی نێو چوارچێوەی ماددەکە و دەستنیشانکردنی سنووری ئیداری هەرێمی کوردستان بە میکانیزمێکی نویَ و بە ٣ قۆناخ. میکانیزمەکە پشت بە چەند پێوەرێکی دیارکراو دەبەستێت: عایدیەتی پێشانی قەزا، یان ناحیە بە پارێزگاکان واتە پێش گۆڕانکاریە نارەواکانی ڕژێمی بەعس / مەسەلەی فرەنەتەوەیی دانیشتووانی ئێستای ناوچەکان / ئاکامی هەڵبژاردنەکانی ساڵی ٢٠٠٥. ئەمە کاکڵی کاری ڕێزدار ستیفان دیمستۆڕایە.

پێش هەموو شتێك مەرجی بنەڕەتیی سەرکەوتنی نوێنەرایەتی (UN) لەکارەکەی: یەکلاکردنەوەی دەور و ئەرکی نوێنەرایەتییەکەیە بە شێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا لە نێوان ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق و پەرلەمانی کوردستان و لە نێوان حکومەتی ناوەندی عێراق و حکومەتی هەرێمی کوردستان، چونکە دەبێت هەردوو لایەنی پێوەندیدار بە کارەکەی (UN) واتە هەردوو لایەنی کێشەکان کە ناوبژیکارییان بۆدەکرێت، بە شێوەیەکی ئاشکرا و دیار بە ناوبژیکردنەکە ڕازی بن و ناکرێت تەنیا لایەنی کوردی بە ناوبژیکردنەکە ڕازی بێت و هەڵویستی لایەنی دیکەی کێشەکانیش دیار نەبێت، یان لایەنی دووەم بەفەرمی هەر دیارنەبێت، یان هەر بە ناوبژیکردنەکە ڕازی نەبێت.

کێ بەشێوەیەکی فەرمی و دیار لایەنی دووەمی کێشەکانی نێو چوارچێوەی ماددەی (١٤٠)ە، جگە لەلایەنی کوردستانی: ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق، یان حکومەتی ناوەندیی عێراق؟ ئایا لایەنی دووەمی کێشەکە بە ناوبژیکردنی (UN) واتە ڕێزدار دیمستۆڕا و هاوڕێکانی ڕازییە؟ ڕوونکرنەوەی وەڵامی ئەم پرسیارانە بەردی بناغەی دەور و ئەرکی ڕێزدار ستیفان دیمستۆڕایە.

بەهەرحاڵ، لە پێشنیاری قۆناخی یەکەمدا، کە لەبارەی ئاکرێ و حەمدانییە و مەخموور و مەندەلی یە ، ٧ هەڵە و نارێکیی دیار دەکەونە بەرچاوان:

یەکەم- تێکەڵاوکردنی مەسەلەی سنووری ئیداری گۆڕاوی پارێزگاکان لەسەردەمی بەعس لە ساڵانی ١٩٧٥-١٩٩٦ واتە مەسەلەی ئاکرێ و مەخموور لەگەڵ مەسەلەی ناوچە دابڕاوەکان لە لیواکانی کوردستان لەسەردەمی دامەزراندنی دەوڵەتی پاشایەتی عێراق لە ساڵانی ١٩١٨-١٩٢١ واتە مەسەلەی حەمدانییە و مەندەلی. لێرەدا دوو کێشە تێکەڵاودەکرێن و پێوەرەکە نارێکە - وەك ئەوە وایە ٤ زەوی کەسێك لە لایەن کەسێکی دیکە زەفتکرابێت، دووان پێشان و دووانیش پاشان، ناوبژیکار بڵێت: با دووانەکەی لەمێژە زەفتکراون بۆ زەفتکەر بێت و دووانەکەی تازەش زەفتکراون، بەناتەواوی بۆ خاوەنی ڕەسەنی زەوییەکان بگەڕێندرێنەوە، کەچی هێشتا زەفتکەریش نە بە ئەنجامی ناوبژیکردنەکە ڕازی بێت و نە ئامادەبێت بەفەرمی هەر دان بە مەسەلەی ناوبژیکردنەکە دا بنێت.

دووەم- پارچەکردنی قەزای مەخموور بە جیاکردنەوەی ناحیەی قەراج و لکاندنی بە پارێزگایەکی عەرەبی سوننی، لەبەر بوونی ڕێژەیەك لە دانیشتووانی عەرەب لە وێ! ئەمەیان بە هیچ شێوەیەك لەگەڵ ئەرکی ڕێزدار دێمستۆڕا ناگونجێت و کارێکی ڕەوا نییە و مەسەلەکان ئاڵۆزتر دەکات، هەروەها لەگەڵ پێوەری عایدیەتی پێشانی قەزاکان و لەگەڵ پێوەری ئاکامەکانی هەڵبژاردنەکانی ٢٠٠٥ دا ناگونجێت.

سێیەم- بەکارهێنانی چوارچێوەی دەسەڵاتی هەرێم و دەسەڵاتی حکومەتی ناوەندی بۆ عایدیەتی "ناوچە کێشەدارەکان". لێرەدا دەبوایە

چوارچێوەی سنووری ئیداری پارێزگان بۆ عایدیەتی قەزا و ناحیەکان بەکاربهێنێت، واتە قەزای ئاکرێ بەفەرمیش بگەڕێتەوە سەر پارێزگای دهۆك (وەك پێشان) و هەروەها قەزای مەخموور بە تەواوی بگەڕێتەوە سەر پارێزگای هەولێر (وەك پێشان)، چونکە بە شێوەی ئێستا وەك دابەشکردنی چوار ناوچە لە نێوان هەرێمی کوردستان و حکومەتی ناوەندیی عێراق دەکەوێتە بەرچاوان و شێوازی عێراقی فیدراڵی وەدەرناخرێت، نوێنەرە عەرەبە سوننییە شۆڤێنییەکان وەك جیاکردنەوە پرۆپاگاندەی دژ دەکەن.

چوارەم- پێوەری عایدیەتی پێش گۆڕانکارییەکانی ڕژێمی بەعس لەبارەی مەندەلی و حەمدانییە بەشێوەیەکی نارێك بەکارهێنراوە ، چونکە لە کاتی دامەزراندنی پاشایەتی عێراق لە لکاندنی خانەقین و مەندەلی بە دیالە و پاشەڕۆژی ویلایەت، هەروەها لیوای موسل، ڕێز لە ویست و خواستی کورد و کلدان و ئاسوری و تورکمان لە وێ نەگیراوە. هەروەها ستەمی دەربەدەرکردنی کورد و تەعریب لە مەندەلی لەسەردەمی ڕژێمی بەعس ڕاچاونەکراوە (ئەم دوو فاکتەرانە ناکرێت پشتگوێ بخرێن).

پێنجەم- لە بەکارهێنانی پێوەری ئاکامی هەڵبژاردنەکانی ساڵی ٢٠٠٥ لە مەندەلی و حەمدانییە نە مەسەلەی دەربەدەرکراوەکان و تەعریب و نە مەسەلەی خواستی ئێستای هەموو دانیشتووان (کورد و میللەتانی دیکە) ڕاچاونەکراون.

شەشەم: لە پلانەکە کوردی ئێزدی و شەبەك و کاکەیی وەك ٣ گرووپی جیا لە کورد دانراون، ئەمەش نە ڕاستە و نە ڕەوایە و ڕەنگدانەوەی هەمان

سیاسەتی کۆنی ڕژێمی بەعس و دەسەڵاتی کۆلۆنیالیستی بەریتانییە لە کوردستانی باشوور، کە لەسەر بنەڕەتی تەکتیکی "پارچە پارچەیان بکە و زاڵ بە" دامەزراوە و بەهیچ جۆرێك پەسەند نییە. ناسنامەی نەتەوەیی ئەو خەڵکانە دەبێت خۆیان دیاریبکەن، نەك خەڵکی دیکە.

حەفتەم- دەبێت پێوەری خواستی دانیشتووانی ڕەسەنی (واتە پێش تەعریبی) گشت قەزا و ناحیەکانی پارێزگای کەرکووك و گشت ناوچە "کێشەدار"ەکان یەکەم پێوەر بێت بۆ: لادانی ستەم و چاککردنەوەی گۆڕانکارییە ئیدارییە نارەوا کانی ڕژێمی بەعس و چارەسەرکردنی مەسەلەی دابڕاندنی خانەقین و مەندەلی و شەنگال و شێخان لە لیواکانی کوردستانی باشوور لەسەردەمی داگیرکاریی بەریتانیدا، واتە گرنگترین پێوەر بێت لە پلان و کاری نوێنەرانی (UN)، هەروەك لە ماددەی (١٤٠) دا چەسپاوە.

لێرەدا، جارێکی دیکە (وەك مامۆستای مێژووی سیاسی نوێی کورد و جوگرافیای سیاسی کوردستان لە کۆلێژی یاسا و ڕامیاری و پسپۆڕێکی ئەکادیمی دۆزی کورد)، داوا لەسەرکردایەتی سیاسی کوردی و سەرۆکایەتی پەرلەمان و سەرۆکایەتی حکومەتی هەرێمی کوردستان دەکەم، کەوا پێش هەمو شتێك مەسەلەی یەکلاکردنەوەی بوون و ڕازیبوونی لایەنی دووەمی کێشەکان بەفەرمی و ئاشکرایی بە پرۆسەی ناوبژیکردنەکەی ڕێزدار دێمستۆرا مسۆگەر بکەن، چونکە ناوبژیکردن لە نێوان دوو لایەنی دیار و بەرەزامەندی هەردوو لایەن دەبێت. هەروەها تکا دەکەم کە لە گفتوگۆکردن لەگەڵ ڕێزدار ستیفان دیمستۆرا و وەفدی (UN) دا، بە جیددی پشت بە

ڕاوێژکاریی لەگەڵ پسپۆڕانی زانستەکانی سیاسەت و یاسا و جوگرافیا و مێژوو ببەستن بۆ لێگرتنی نوێنەرانی گفتوگۆ و بەرپرسانی بەدواداچوونی لایەنی کوردستانی پێوەرەکانی: زانایی لە بابەتەکان و توانای زمانناسی (بەتایبەتی عەرەبی و ئینگلیزی) و شارەزایی لە بواری دیالۆگ بگرنەبەر، تاوەکو ئەم مەسەلە گرنگە بە وردی و ڕاشکاوانە واتە دروست و ڕوون بۆ هەموو لایەنێك شی و دیاربکرێت، مەسەلەی ناوبژیکردنی ڕیزدار دیمستۆڕا و پرۆسەی دیالۆگ سەرکەوتوو بێت.

## ماددەی (١٤٠) و ناوچە دابڕێندراوەکانی کوردستان

ڕاستە، کەوا ماددەی (١٤٠) ماددەیەکی بنەڕەتی دەستووری هەمیشەیی عێراقە و شەرعییەتی خۆی لەم دەستوورە وەرگرتووە، کە نزیکەی چوار لەسەر پێنجی خەڵکی عێراق پەسەندیان کردووە، بەبێ ڕەزامەندی گەلی کوردیش نەلادەبردرێت و نە هەموار دەکرێت. هەروەها ماددەکە هێزی یاسایی خۆی لەمەوە وەرگرتووە: ئەو کێشەیەی کە بۆ چارەسەرکردنی دانراوە، هێشتا چارەسەرنەکراوە. بۆیە هەرچەندە ماوەی جێبەجێکردنی دیاریکراوی لە دەستووردا بەسەرچووە، هێشتا مەفعولی تەواوی ماوە و بالۆرە و بانگەشەی کۆنە بەعسی و هاوڕاکانیان لەم بارەیەوە —کە گوایە مەفعولی نەماوە- هیچ بنەمایەکی یاسایی و شەرعی نییە و پێویستە لەسەر دەسەڵاتی جێبەجێکردنی ئیتیحادی واتە حکومەتی عێراق جێبەجێی بکات. **بەڵام** چونکە میکانیزمی جێبەجێکردنی بڕگەی (ب)ی ماددەی (٥٨) سەقەتە، ئەمە بووەتە گەورەترین کۆسپی دەستووری و یاسایی لەسەر ڕێگەی جێبەجێکردنی گرنگترین بەشی ماددەکە، لەبەر ئەوەی ڤیتۆی ڕەزامەندی ئیجماعی بەخشیوە بە جێگری عەرەبی سوننی سەرۆك کۆمار، چونکە ئەسلی کێشە لەسەر خاکە و کێشەکەش ڕاستەوخۆ لەگەڵ پارێزگاکانی عەرەبی سوننییە، جێگری عەرەبی سوننی سەرکۆمار (ڕیزدار تارق هاشمی) ڕێگرە لەپێش جێبەجێکردنی ناوەرۆکی بڕگەی

ناوبراو، واته ڕازی نییه به چاکردنەوەی سنووره ئیدارییه شێواوەکانی پارێزگاکانی کوردستان (کەرکووك و هەولێر و دهۆك)، جگه له ڕێگرتن له چاکردنەوەی سنووری شێواوی پارێزگای کەربەلاش له باشووری عێراق. چونکه سەرۆك کۆمار (ڕێزدار جەلال تاڵەبانی) و جێگره عەرەبه شیعییەکەی (ڕێزدار عادل عەبدولمەهدی) نەیانتوانی (ڕێزدار تارق هاشمی) ئیقناع بکەن، به گرنگیی ئیجماع بۆ ڕێنمایی هاوبەش بەپێی دەستوور بۆ ڕاستکردنەوەی سنووره ئیدارییه گۆڕاوەکان، که لەلایەن ڕژێمی بەعس بەشێوەیەکی نارەوا و له پێناوی مەبەستی سیاسی ئەنجام دراون، هەروەك له دەستووردا سەلمێندراوه و چەسپاوه. چونکه گشت هێزه سیاسییه عەرەبییه سوننییەکان لەسایەی بیرێکی شۆڤینی و عەقلییەتێکی له داگیرکردن ڕاهاتوو و خۆ بەزلتر دانان، نەك تەنیا دژی گەڕاندنەوەی ناوچه دابڕاوەکانی کوردستانن، بەڵکو دوژمنی وشەی کوردستانیشن. چونکه هەرسێ حکومەتی عێراقی نوێ (کاتی و گواستنەوه وهەمیشەیی) ئیرادەی سیاسییان له جێبەجێکردنی ماددەکه بەکردەوه نەبووه ونییه. چونکه حکومەتەکانی دەوڵەته دابەشکەرەکانی کوردستان هەر له سەرەتاوه بەربەرەکانی ناوەرۆکی ماددەکه دەکەن ... . بۆیه ماددەکه له کاتی دەستووری دیاریکراوی خۆیدا، واته تا کۆتایی ساڵی ٢٠٠٧ جێبەجێنەکرا و لەوکاتەشەوه تا ئێستا سڕکراوه و له واقیعدا خەریکه ببێته "خَبَّر کانً"! لەمایەی ئەوەشەوه کێشەی ناوچه دابڕاوەکانی کوردستان، که دەناسرێت به "ناوچه کێشه لەسەرەکان"، نەك تەنیا ئاڵۆزتر بووه، بەڵکو جگه له

کەرکووك لە موسل و دیالەش بەشێوەیەکی دژوار تەشەنەی کردووە، بەتایبەتی لە موسل پاش گرتنە دەستی دەسەڵات لەلایەن "لیستی حەدبای برایانی نوجەیفی". بۆیە کێشەی سنووری باشووری هەرێمی کوردستانیش —کە لە دەستوور یەکلانەکراوەتەوە- بووەتە گەورەترین و گرنگترین کێشەی هەڵپەسێردراو و هەڵواسراو لە نێوان حکومەتی هەرێمی کوردستان و حکومەتی ئیتیحادی عێراق. لێرەدا دەبێت بزانرێت: کەوا ئێستا تەنیا پێوەری دەستووریی دەستنیشانکردنی سنووری باشوور و باشووری ڕۆژئاوای هەرێمی فیدرالی کوردستان: ماددەی (١٤٠)ی سڕکراوە.

ئاشکرایە کە لایەنە عەرەبییەکان، بەتایبەتی لایەنی عەرەبی سوننی، تەگەرەی زۆریان خستووەتە سەر ڕێگەی جێبەجێکردنی ماددەی (١٤٠) و حکومەتی ئیتیحادی عێراقیش جیدی نییە لە جێبەجێکردنیدا، چونکە حکومەتی ئیتیحادی عێراق دەبوایە هەم پابەند بوایە بە دەستووری هەمیشەیی و هەم پابەند بوایە بە بەرنامەی کاری حکومەتی ئیئتیلافی و ماددە دەستوورییەکەی لە کاتی دیاریکراوی خۆیدا لە دەستوور جێبەجێ بکردایە، کەچی حکومەتی ئیتیحادی کەمتەرخەمی کردو ئەرکی خۆی لەم بارەیەوە بەجێنەگەیاند. بەڵام بۆ ئەوەی هەڵسەنگاندنێکی بابەتییانە و دروست بۆ مەسەلەکان بکرێن، دەبێت ڕاشکاوانە لاوازی ئەدای لایەنی کوردستانی و هەڵەکانی لەم بوارەدا بە وردی دەستنیشان بکەین، بۆ ئەوەی تا کاتی گونجاو لەبەر دەست دایە چارەسەر بکرێن:

پێش هەموو شتێك ڕوون و ئاشكرایە، كەوا میكانیزمی جێبەجێكردنی كرۆكی ماددەی (١٤٠) دەبوایە هەڵوەشاندنەوەی بڕیارە نارەواكانی رژێمی بەعس بووایە، كە بوونەتە هۆی دابڕاندنی ناوچەكانی كوردستان و سەرچاوەی دروستبوونی كێشەی "ناوچە كێشە لەسەرەكان"، بەتایبەتی بڕیاری ژمارە (٤١)ی ساڵی ١٩٧٦ و بڕیاری ژمارە (٤٣٤)ی ساڵی ١٩٨٩، نەك ئیجماعی هەر سێ ئەندامانی ئەنجومەنی سەرۆكایەتی كۆمار. هەروەها ئەم میكانیزمە جگە لە سەقەتیی نارەواشە، چونكە ئیجماعی هەر سێ ئەندامی ئەنجومەنی سەرۆكایەتی كۆمار مەرجێكی تەعجیزییە و جێگری عەرەبی سوننی قەت ئامادە نابێت و دەیكاتە بیانووی ڕازینەبوون، بۆیە پەسەندكردنی ئەم میكانیزمە ناكۆكە لەگەڵ مەبەستی سەرەكی ماددەی (٥٨)ی یاسای ئیدارەی كاتی و چەسپاندنیشی لە دەستووری هەمیشەییدا هەڵەیەكی یەكجار گەورەبووە، كە لایەنی كوردستانی لە كاتی گفتوگۆدا لەم بارەیەوە تێیكەوتووە. لە ڕاستیدا ئەمە "فێڵێكی یاسایییە" كاتی خۆی لە لایەن نوێنەرانی عەرەبی سوننی بەتایبەتی لە كورد كراوە. نووسەری ئەم گوتارە لە ٢٠ تەمووزی ٢٠٠٥ لە بانگكردنێكی ڕاوێژكاریی تایبەتدا لەلایەن سەركردایەتی سیاسییەوە لە سەلاحەددین، سەرنجیانی ڕاكێشا بۆ ئەم هەڵەیە و بۆ پێویستیی چارەسەركردنی لە دەستووری هەمیشەییدا. هەروەها جگە لەم هەڵەیە، هەڵەیەكی گەورەی دیكەش لە نووسینی دەستووری هەمیشەیی ڕووی داوە و لایەنی كوردی پێی ڕازی بووە!، ئەویش بریتییە لە نەمانی ئەو ماددەیەی كە دروستترین پێوەری دەستنیشانكردنی سنووری هەرێمەكانی تێدا بوو لە یاسای

ئیدارەی کاتیدا (ماددەی ٤)، واتە ڕاستییە مێژویی و جیۆگرافییەکان، هەرچەندە نووسەری گوتار لە دانیشتنی ناوبراودا جەختی لەسەر گرنگی ئەم ماددەیە و چاکترکردنی بۆ دەستووری هەمیشەیی کرد بە جەختکردن لەسەر فیدرالیزمی هەرێمیی (فدرالیە الاقالیم)، بەڵام جێگەی سەرسوڕمانە کەوا ئەم ماددە گرنگە هەرنەما لە دەستووری هەمیشەیی! بۆیە ئێستا تەنیا پێوەری دەستووریی دەستنیشانکردنی سنووری هەرێمی کوردستان ماددەی (١٤٠)ە.

هەروەها لایەنی کوردی هەڵەیەکی زۆر گەورەی دیکەی کرد، کە ماددەی (١٤٠) لەکاتی دیاریکراوی خۆی لە دەستووردا واتە تا ٢٠٠٧/١٢/٣١ جێبەجێنەکرا، چونکە نە فراکسیۆنی هاوپەیمانی کوردستانی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق و نە پەرلەمان و حکومەتی هەرێمی کوردستان هیچ کاردانەوەیەکی یاساییان لەم بارەیەوە نەبوو! هەرچەندە نووسەری ئەم گوتارە، لە دانیشتنێکی ڕاوێژکاریی بەپەلە لە نێوان بەرپرسی لیژنەی بە دواداچوونی جێبەجێکردنی ماددەی (١٤٠)ی پەرلەمانی کوردستان و ١٠ پسپۆڕ و مامۆستای زانکۆی سەلاحەددین لە بوارەکانی یاسا و سیاسەت و جیۆگرافیا لە ڕێکەوتی ٢٠٠٧/١٢/١٥، بۆ ئەم ئەگەرە کە پێشبینیی دەکرا جەختی لەسەر ئاڕاستەکردنی سکاڵانامەیەك بۆ دادگای ئیتیحادی باڵا لە بەغداد کردەوە، چونکە لەو حاڵەتە دادگای باڵا بەپێی یاسا و لەبەر ڕۆشنایی دەستوور و بە تاوتۆیکردنی بارودۆخەکە بە بڕیارێکی یەکلاکەرەوە حکومەتی ئیتیحادی پابەند دەکرد بە جێبەجێکردنی ماددەی (١٤٠) لە کاتێکی دیاریکراوی

دیکەدا. دەقی خاڵی یەکەم لە یاداشتێکی نووسراوی ڕۆژی پاشتریش بۆ جێگری سەرۆکی پەرلەمان لەم بارەیەوە بەم شێوەیە بوو:

**" سکاڵایەك پێشکێش بکرێت بە دادگەی فیدرالی عێراق (المحکمە الاتحادیە) — لەلایەن پەرلەمانی کوردستان، یان فراکسیۆنی هاوپەیمانیی کوردستان لە ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق، یان لیژنەی باڵای جێبەجێکردنی ماددەی ١٤٠ - لەپێناوی چەسپاندنی بەرپرسیاری هەرسێ حکومەتی عێراقی (کاتی و گواستنەوە و هەمیشەیی) لە کەمتەرخەمیی لە جێبەجێکردنی ماددەی ٥٨ و پاشان ماددەی ١٤٠ و لە پێناوی بڕیاردان بۆ مانەوەی مەفعولی ماددەکە بەشێوەیەکی یاسایی (دەستووری) تا تەواوکردنی جێبەجێکردنی لە پێناوی پابەندکردنی حکومەتی عێراق بە تەواوکردنی جێبەجێکردنی ماددەکە لە ساڵی ٢٠٠٨.**

جگە لە مانەش ماددەی (٥٨) کە بناغەی ماددەی (١٤٠)ە، چەند کەم وکورتییەکی تێدایە. بۆ نموونە: لە بڕگەی (ج)ی ماددەی (٥٨) دا: "خاکە کێشە لەسەرەکان" لە نێوانیاندا کەرکوك ...، جگە لە کەرکوك هیچ شوێنێکی دیکە دیارنەکراوە. هەروەها پرسیاری ڕاپرسی ڕوون نەکراوەتەوە ... . لە هەمووشی گرنگتر هەڵەی چەسپاندنی چەمکی "الارا ضي المتنازع علیها" واتە "خاکە کێشە لەسەرەکان"ە، کە هەم لە بواری یاسایی و هەم لە بواری سیاسی ناڕەوایە، چونکە ڕژێمی بەعس ئەم خاکانەی بە زۆر لە ساڵانی ١٩٧٤ و ١٩٩١ لە خاك و قەوارەی کوردستان دابڕیوە، لە بواری دەربڕینیش

زاراوەیەکی نەگونجاوو ئیستیفزازی و مایەی نائارامی و رِك و کینەیە. بۆ چاکردنەوەی هەڵەکان پێویستە ئەم خاڵانەش لەبەرچاو بگیرین.

بۆیە ئەگەر بمانەوێت ماددەی (١٤٠) بەکردەوە جێبەجێبکرێت: دەبێت میکانیزمی برِگەی (ب)ی ماددەی (٥٨) و کەم وکورتییەکانی دیکەی ماددەی (٥٨)چاکبکرێنەوە، ئەمەش دەکرێت لە رِێگەی هەموارکردنی ماددەی (١٤٠) بە پێی پێشنیاری لایەنی کوردی بێت، لە چوارچێوەی هەموارکردنی دەستووری هەمیشەییدا، کە دەبێت بە گوێرەی ماددەی (١٤٢)ی دەستوورەوە ئەنجام بدرێت.

هەروەها بۆ چارەسەرکردنی کێشەی ناوچە دابرِاوەکانی کوردستان (کە رِژێمی بەعس بە ناهەق لە قەوارەی "ناوچەی ئۆتۆنۆمی" و "پەناگەی ئارام" دایبرِیون) و کێشەی سنووری باشووری هەرێمی فیدراڵی کوردستان (کە لە دەستووری هەمیشەیی پێوەریشی یەکلانەکراوەتەوە)، بە شێوەیەکی بنەرِەتی: دەبێت ماددەی (١٤٣)ی دەستووریش هەموار و تەواوبکرێت، چونکە لە برِگەی (أ)ی ماددەی (٥٣)ی یاسای ئیدارەی کاتییش فێڵێکی دیکەی "یاسایی" لە کورد کراوە، لەبەر ئەوەی لەوێدا هەرچەندە دان بە حکومەتی هەرێمی کوردستاندا نراوە: بەڵام لە سەر ئەو ئەرزانەی کە لە رِۆژی ٢٠٠٣/٠٣/١٩ لە ژێر دەسەڵاتیدا بوون، واتە لە چوارچێوەی "پەناگەی ئارام — Safe Haven" دا، واتە بێی ناوچە دابرِێندراوەکان لەلایەن رِژێمی بەعس! ئەم برِگەیەش بووەتە بەشێك لە ماددەی ناوبراوی دەستوور. ئەگەر تێبینییەکانی رِاوێژکارییەکانی پێشووم لەلایەن گرووپی کوردی لیژنەی

نووسینی دەستووری عێراقی و سەرۆکایەتی پەرلەمانی کوردستان و وەزارەتی ناوچە دابڕاوەکانی کوردستان گرنگیان پێدرابوایە، بێگومان ئێستا ئەم گرفتانە نەداهتنە پێش.

لێرەدا من، وەك مامۆستا و پسپۆرێکی دۆزی کورد لە کۆلێژی یاسا و ڕامیاری، کە ماددەی (١٤٠) لە چوارچێوەی دەستووری هەمیشەیی عێراقی و بابەتی کێشەکانی ناوچە دابڕاوەکان و سنووری هەرێمی کوردستان لە چوارچێوەی باری دۆزی کورد و جیۆگرافیای سیاسی کوردستان لە کۆلێژی ناوبراو شیدەکاتەوە، و وەك توێژەرێکی ئەکادیمی لە بواری مەسەلە سیاسییە ستراتیژییەکانی هەرێم و عێراق، ئامادەیی تەواوی خۆم دەردەبڕم: بۆ ڕاوێژکاری زیاتر لەم بارەیەوە لە هەر جێگە و کاتێکی پێویست بێت — بەڵام بەمەرجێك بایەخیان پێ بدرێت و وەك جارانی پێشوو پشتگوێ نەخرێن، بۆئەوەی لەمە زیاتر هەڵەی کوشندە لەبارەی مەسەلە ستراتیژیەکانی کورد لە چوارچێوەی پرۆسەی سیاسی لە عێراقی نوێدا نەکرێن و بۆ ئەوەی کۆششی منیش بەفیڕۆ نەچێت و پاشانیش نەبێتە مایەی غەمباری پترم. هەروەها ئامادەشم بۆ بەشداریکردنی ڕاستەوخۆش لە ئەرکی بەدواداچوونی ماددەی (١٤٠) و کێشەی ناوچە دابڕێندراوەکان و سنووری هەرێمی فیدراڵی کوردستان. ئەم ئامادەکارییەشم بە ئەرکێکی پیرۆز دەزانم بۆ خزمەتکردنی دۆزی ڕەوای کورد لە چوارچێوەی بەرژەوەندی نەتەوەیی و نیشتمانی باڵا و لە پێناوی چارەسەرییەکی ئاشتیخوازانە و دەستووریانەی کێشە گرنگە هەڵواسراوەکان لە نێوان حکومەتی هەریمی کوردستان و حکومەتی ئیتیحادی عێراق.

## واقیع و پاشەڕۆژی ماددەی (١٤٠)

### دەبێت سەرۆکایەتی هەرێم و حکومەتی هەرێمی کوردستان چی بکە بۆ جێبەجێکردنی ماددەکە لە لایەن حکومەتی مەرکەزی (ئیتیحادی) عێراق؟

ماددەی (١٤٠) ماددەیەکی بنەڕەتی دەستووری ئیتیحادی هەمیشەیی عێراقە و شەرعییەتی خۆی لەم دەستوورە وەرگرتووە، کە نزیکەی چوار لەسەر پێنجی خەڵکی عێراق (٧٨٪) لە ڕیفراندۆمێکی ئازاد و مێژوویدا پەسەندیان کردووە، مەفعولیشی بەندە بە مەفعولی دەستووری هەمیشەیی و بەبێ ڕەزامەندی هاووڵاتیانی هەرێمی کوردستانیش ئەم ماددەیە و هیچ ماددەیەکی دیکە و دەستووری هەمیشەیی عێراق بە گشتیی هەموار ناکرێت، چونکە بە پێی میکانیزمی ماددەی (١٤٢) کە پەیوەستە بە هەموارکردنی دەستوور، نابێت هیچ هەموارکردنێکی دەستووری هەمیشەیی عێراق لەلایەن دوو لەسەر سێی دەنگدەرانی سێ پارێزگا ڕەتبکرێتەوە. هەروەها هێزی یاسایی ماددەکە بەندە بە چارەکردنی ئەو گرفتەی لەپێناوی دانراوە و هێشتا چارەسەرنەکراوە. بۆیە هەرچەندە ماوەی جێبەجێکردنی دیاریکراوی لە دەستووردا بەسەرچووە، چونکە لایەنە پێوەندیدارەکان بە جێبەجێکردنی ئەرکی خۆیان لەم بارەیەوە بەجێنەگەیاندووە، هێشتا مەفعولی تەواوی ماوە و بانگەشە و باڵۆرەی کۆنە بەعسی و هاوڕا شۆڤینییەکانیان لەم بارەیەوە — کە گوایە مەفعولی نەماوە— هیچ بنەمایەکی یاسایی و شەرعی نییە، هەرکەسێکیش بانگەشە بۆ بەم ناڕاستییە

بكات، یان زۆر ساكار و نەزانە، یان بە ئاشكرا دەیەوێت فێڵ لە خۆی و لە خەڵكی بكات و بۆ هەمان مەبەستی بەعسی فاشی دژی گەلی كورد هانیان بدات! خۆ ئەگەر وابێت، ئەوا ماددەی (١٤٢)ش زۆر لە مێژترە، هەر لەسەرەتای ساڵی (٢٠٠٦)وە، ماوەی جێبەجێكردنی بەسەرچووە و دەبێت ئەویش مەفعولی نەمابێت، بەڵام بێگومان ئەم دوو ماددانە بە تایبەتی و هەموو ماددەكانی دیكەی دەستووری ئیتیحادی بەگشتی مەفعولی تەواوی خۆیان هەیە و دەمێنێت تاوەكو ئەو مەسەلانەی بۆ چارەكردنیان دانراون كۆتاییان پێدەهێت، ئەگەر دەستووریش لە چوارچێوەی ریفراندۆم و لەسەر بنەمای ماددەی (١٤٢) هەموار بكرێت، چونكە هەمواركردنی دەستوور تەنیا بەپێی میكانیزمی هەمواركردنی ناوبراو دەكرێت. بۆیە پێویستە لەسەر دەسەڵاتی جێبەجێكردنی ئیتیحادی واتە حكومەتی عێراقی داهاتوو جێبەجێی بكات، بەخۆلادان لە هەموو كۆسپ و نەهێشتنی گشت تەگەرەیەكی سەر رێگەی جێبەجێكردنی. پێویستە سەرۆكایەتی و حكومەتی هەرێمیش لیژنەیەكی نوێی لێهاتوو بۆ بەدواداچوونی جیددی و كارای جێبەجێكردنی ماددەكە پێكبهێنێت، چونكە بە ڕاشكاویی لیژنە كۆنەكان لە ئاستی ئەم ئەركە گران و ستراتیژییە نەبوون ونیین.

**ئێستاش با ڕوونی بكەینەوە واقیعی ناوەرۆكی ماددەی (١٤٠)ی دەستووری هەمیشەیی عێراق چییە؟ و دەبێت چ بكرێت تا، كۆسپ و تەگەرەكانی سەر ڕێگەی لابردرێن واتە، جێبەجێ بكرێت؟**

هەردوو خاڵی ماددەی (١٤٠)ی دەستووری هەمیشەیی جەخت لەسەر تەواوكردنی جێبەجێكردنی ناوەرۆكی ماددەی (٥٨) یاسای ئیدارەی دەوڵەتی عێراقی

بۆ ماوەی گواستنەوە دەکەن، کە چارەسەرییەکی دەستوورییە بە تایبەتی بۆ کێشەی گۆڕینی سنوورە ئیدارییەکانی ٨ پارێزگا لە لایەن ڕژێمی بەعسی ڕووخاو بە زۆری و لەبەر هۆی ڕەگەزپەرستانە و تایفەگەریی واتە بەمەبەستی گەورەترکردنی ٤ پارێزگا کە زۆربەی دانیشتوانیان عەرەبی سوننی بوون (نەینەوا و سەلاحەددین و دیالە و ئەنبار) بە بچووککردنەوەی ٣ پارێزگای زۆربەی دانیشتووانیان کوردبوون (کەرکووك، دهۆك و هەولێر) و پارێزگای (کەربەلا) کە زوربەی دانیشتووانی عەرەبی شیعەن. هەروەها ئەم چارەسەرییە جگە لەوەی دەستووریە، چارەسەرێکی ناوەندیشە (کۆمپرۆمیسی نێوان گشت لایەنە عێراقییەکانە) و بەرەزامەندی نوێنەرانی گشت پێکهاتەکانی عێراق لە کاتی سازکردنی یاسای ئیدارەی گواستنەوە دانراوە و پاشانیش دیسان لەلایەن نوێنەرانی گشت پێکهاتەکانەوە لە کاتی ئامادەکردنی ڕەشنووسی دەستووری هەمیشەیی وەك بەشێکی ماددەی (١٤٣) چەسپێندراوە و دواییش لە ڕاپرسییەکی دیار بە ئاشکرا وەك بەشێکی دەستووری ئیتیحادی هەمیشەیی بە زۆرینەیەکی بەرچاو پەسەندکراوە.

بەلام ئاشکرایە کە میکانیزمی جێبەجێکردنی بڕگەی (ب)ی ماددەی (٥٨)، کە کاکڵی ماددەکەیە ناکۆکە (سەقەتە)، بۆیە ئەم ناکۆکییە هەر لەسەرەتاوە بووەتە گەورەترین کۆسپی دەستووریی لەسەر ڕێگەی جێبەجێکردنی گرنگترین بەشی ماددەکە، کە لە دەستوور - بەمەبەستی چاککردنەوەی سنوورە ئیدارییە شێواندراوەکان لە لایەن ڕژێمی بەعسی فاشییەوە - چەسپێندراوە، بە تایبەتی یەکگرتنەوەی پارێزگای کەرکووکی لەتلەتکراو و کورد لێکەمکراوە بە گەڕانەوەی هەر چوار قەزا بەزۆر لێدابڕاوەکان لێی بۆ چوارچێوەی سنووری ئیداری پارێزگای ئەسلی

خۆیان. بەڵام لەبەرئەوەی میکانیزمی جێبەجێکردنی ئەم بڕگەی (ب)ایە ڤیتۆی ڕەزامەندی ئیجماعی بەخشیوە بە جێگری عەرەبی سوننی سەرکۆماریش،چونکە ئەسلی کێشەکە لەسەر خاکە و کێشەکەش ڕاستەوخۆ لەگەڵ پارێزگاکانی عەرەبی سوننییە، لەبەرئەوەی هەموو قەزا و ناوچە دابڕێندراوەکان لە پارێزگا کوردستانییەکان (کە زۆرینەی دانیشتووانیان کورد لەسەرژمێریی ۱۹۵۷ کوردبوون) خراونەتە سەر پارێزگا عەرەبییە سوننییەکان (موسل و تکریت و دیالە)، بۆیە جێگری عەرەبی سوننی سەرکۆمار (ڕێزدار تارق هاشمی)توانی ڕێگر بێت لەپێش جێبەجێکردنی ناوەرۆکی بڕگەی ناوبراو، واتە ڕازی نەبووە بەچاککردنەوەی سنوورە ئیدارییە شێواوەکانی پارێزگاکانی کوردستان (کەرکووك و هەولێر و دهۆك)، کە هەمیشە زۆربەی دانیشتووانیان تا پێش گۆڕینە ناڕەواکانی بەعسی فاشی کوردبوون. بەم شێوەویە ڕێزدار هاشمی ڕێگەشی گرت لە چاکردنەوەی سنووری شێواوی پارێزگای کەربەلاش لە باشووری عێراق. چونکە سەرکۆمار (ڕێزدار جەلال تالەبانی) و جێگرە عەرەبە شیعییەکەی( ڕێزدار عادل عەبدولمەهدی( نەیانتوانی (ڕێزدار تارق هاشمی) ئیقناع بکەن، بە گرنگیی ئیجماع بۆ ڕێنمایی هاوبەش بەپێی دەستوور بۆ ڕاستکردنەوەی سنوورە ئیدارییە گۆڕاوەکان، کە لەلایەن ڕژێمی بەعس بەشێوەیەکی ناڕەوا و لە پێناوی مەبەستی سیاسی بە دابڕاندن ئەنجام دراون، هەروەك لە دەستووردا سەلمێندراوە و چەسپاوە، چونکە گشت هێزە سیاسییە عەرەبییە سوننییەکان لەسایەی بیرێکی شۆڤینی و عەقلییەتێکی لەداگیرکردن ڕاهاتوو و خۆ بەزلتر دانان لە کورد، نەك تەنیا دژی گەڕاندنەوەی ناوچە دابڕاوەکانی کوردستانن بۆ چوارچێوەی پارێزگا ئەسلییەکانیان و هەرێمی کوردستان بە بیانووی ناڕەوا و نامەنتیقی، بەڵکو نەیاری

وشەی کوردستانیشن. هەروەها چونکە زۆربەی بەرپرسە عەرەبەکانی هەرسێ حکومەتی عێراقی نوێ (کاتیی و گواستنەوە وهەمیشەیی) ئیرادەی سیاسییان لە جێبەجێکردنی ماددەکە بەکردەوە نەبووە ونییە، جگە لەوەی کە حکومەتەکانی دەوڵەتە دابەشکەرەکانی کوردستان هەر لە سەرەتاوە بەربەرەکانی ناوەڕۆکی ماددەکە دەکەن. بۆیە ماددەکە لە کاتی دەستووریی دیاریکراوی خۆیدا، واتە تا کۆتایی ساڵی ٢٠٠٧ جێبەجێنەکرا و لەوکاتەشەوە تا ئێستا بە واقیعی سڕکراوە و زۆر لایەن و بەرپرسی سیاسی و حکومی عەرەب بەئاشکرا دژایەتی دەکەن، هەرچەندە نابێت هیچ لایەنێکی سیاسی و هیچ ئەندامێکی ئەنجومەنی نوێنەران و ئەنجومەنی پارێزگاکان و هیچ بەرپرس و کاربەدەستێکی حکومی دژایەتی، نە ئەم ماددەیە و نە هیچ ماددەیەکی دیکەی، دەستوور بکات، ئەگینا دەکرێت بە دژایەتی دەستوور تاوانباربکرێت و لەسەر ئەم تاوانەش بە پێی یاسا سزا بدرێت، وەك هەموو وڵاتانی دەستووریی جیهان.

لەمایەی ئەم دژایەتییە ناڕەوایە و سەرپێچییە دەستوورییە ئاشکرایەی لایەن و کەسە عەرەبە شۆڤینییەکان کێشەی ناوچە دابڕێندراوەکانی کوردستان، کە دەناسرێت بە "ناوچە کێشە لەسەرەکان" (هەرچەندە کێشەکە لە نێوان ڕژێمی بەعسی فاشی و گەلی کوردی ستەملێکراو بووە)، نەك تەنیا ئاڵۆزتر بووە، بەڵکو جگە لە پارێزگای کەرکووك، لە پارێزگاکانی نەینەوا و دیالەش بەشێوەیەکی دژوار تەشەنەی کردووە، بەتایبەتی لە پارێزگای نەینەوا پاش گرتنە دەستی دەسەڵات لەلایەن "لیستی حەدبای برایانی نوجەیفی"، بۆیە کێشەی سنووری باشووری هەرێمی کوردستانیش -کە لە

دەستوور یەکلانەکراوەتەوە - بووەتە گەورەترین و گرنگترین کێشەی هەڵپەسێردراو و هەڵواسراو لە نێوان حکومەتی هەرێمی کوردستان وحکومەتی ئیتیحادی عێراق.

لێرەدا دەبێت بزانرێت: کەوا ئێستا تەنیا پێوەری دەستووریی دەستنیشانکردنی سنووری باشوور و باشووری ڕۆژئاوای هەرێمی فیدرالی کوردستان: ماددەی (١٤٠)ی دەستووری عێراقە. ئاشکرایە کە لایەنە عەرەبییەکان، بەتایبەتی لایەنی عەرەبی سوننی، تەگەرەی زۆریان خستووەتە سەر ڕێگەی جێبەجێکردنی ماددەی (١٤٠) و حکومەتەکانی ئیتیحادی عێراقیش تا ئێستا جیددی نەبوون لە جێبەجێکردنیدا، لەکاتێکدا حکومەتی ئیتیحادی هەمیشەیی (واتە حکومەتی ڕێزدار مالکی) دەبوایە هەم پابەند بوایە بە دەستووری هەمیشەیی و هەم پابەند بوایە بە بەرنامەی کاری حکومەتی ئیئتیلافی و ماددە دەستوورییەکەی لەکاتی دیاریکراوی خۆیدا لە دەستوور جێبەجێ بکردایە، کەچی حکومەتی ئیتیحادی کەمتەرخەمی کردو ئەرکی خۆی لەم بارەیەوە بەجێنەگەیاند. بەڵام بۆ ئەوەی هەڵسەنگاندنێکی بابەتییانە و دروست بۆ مەسەلەکان بکرێت، دەبێت ڕاشکاوانە لاوازیی ئەدای لایەنی کوردستانی و هەڵەکانی لەم بوارەدا، هەروەها کەموکورتییەکانی بناغەی ماددەی (١٤٠)ی دەستووریش واتە ماددەی (٥٨)ی یاسای ئیدارەی گواستنەوە، کە پێویستییان بە چاککردن هەیە — لەچوارچێوەی هەموارکردنی دەستوور بە پێی ماددەی ١٤٢ - بە وردی دەستنیشان بکەین، بۆ ئەوەی تا کاتی گونجاو لەبەر دەست دایە بەدیالۆگ لەگەڵ حکومەتی ئیتیحادی داهاتووی عێراقەوە بە ڕێکوپێکی چارەسەر بکرێن، **چونکە ئەگەر** کەموکورتییەکانی ماددەی (١٤٠) و بناغەکەی بە پشتیوانی کۆمسیۆنێکی ڕاوێژکاریی باڵای کوردستانی چاکنەکرێن و لێژنەیەکی زانا و کارای شیاوی نوێی

کوردستانیش بەدوای جێبەجێکردنیدا نەچیت، **با چاك بزانرێت** ئەگەر هەموو کوردیش هاوار بکات و خەونی پێوە ببینێت و ئەگەر سیاسەتوانی ئەندامی هەموو حزبە سیاسییە کوردستانییەکانیش کۆببنەوە و هاتووچۆی بەغداد بکەن، ١٤٠ ساڵی دیکەش بەم شێوەیەی تا ئێستا تیپەڕیوە بەسەر بچێت جێبەجێناکرێت، چونکە ئەگەر مرۆڤ هەر گرفتێکی لە ژیاندا هەبێت، تەنیا بە دەستنیشانکردنی تەواوی هۆیەکانی گرفتەکە و بیرکردنەوەیەکی واقیعیانە و پشتبەستن بە ڕاوێژکاریی گونجاوی پسپۆڕانی بە توانا و بەجورئەت دەگاتە چارەسەریی دروستی گرفتەکە:

هەروەکو لەسەرەوە شیمانکردەوە ماددەی (١٤٠)ی دەستوور جەخت لەسەر تەواوکردنی جێبەجێکردنی ماددەی (٥٨)ی یاسای ئیدارەی کاتیی دەکات، ڕوونیشمانکردەوە کەوا میکانیزمی جێبەجێکردنی کرۆکی ماددەی (٥٨) واتە بڕگەی (ب) تەعجیزییە، چونکە جێگری عەرەبی سوننی سەرکۆمار (ڕێزدار تارق هاشمی)، لە سایەی مەرجی نامەنتیقی ئیجماع، ڕێگرە! جگە لەمەش بەپێی ماددەی (١٣٨)ی دەستوور ئەنجومەنی سەرۆکایەتی کۆمار پاش دەورەی یەکەم، واتە لەم دەورەیەی ئێستادا نامێنێت و بەپێی ماددەی (٧٥)ی دەستووریش سەرکۆمار یەك جێگری دەبێت (نەك زیاتر)، کەوابێت ئەم میکانیزمە سەقەتەش، جگە لە ناکۆکی تووشی بارێکی نوێ و نادیاریش دەبێت و دەبێت لایەنی کوردستانی بە گشتی و سەرۆکایەتی و حکومەتی هەرێم بە تایبەتی باش ئاگاداری ئەم مەسەلەیە بن.

ڕوون و ئاشکرایە، کەوا میکانیزمی دروستی جێبەجێکردنی کرۆکی ماددەی (٥٨) واتە بڕگەی (ب) دەبوایە هەڵوەشاندنەوەی بڕیارە نارەواکانی ڕژێمی بەعس بووایە، کە بوونەتە هۆی دابڕاندنی ناوچەکان لە پارێزگا ئەسلییەکانیان واتە بوونەتە

سەرچاوەی دروستبوونی کێشەی "ناوچە کێشە لەسەرەکان"، بەتایبەتی بڕیاری ژمارە (٦٠٨)ی ساڵی ١٩٧٥ تایبەت بە دابڕاندنی قەزاکانی چەمچەماڵ و کەلار و کفری لە پارێزگای کەرکوك و بڕیاری ژمارە (٤١)ی ساڵی ١٩٧٦ تایبەت بە دابڕاندنی قەزای دوزخۆرماتوو لە پارێزگای کەرکوك و بڕیاری ژمارە (١١٨)ی ساڵی ١٩٧٦ تایبەت بە دابڕاندنی ناحیەی مزوری لە پارێزگای دهۆك و بڕیاری ژمارە (٧٥٧)ی ساڵی ١٩٨٠ تایبەت بە دابڕاندنی قەزای ئاکرێ لە پارێزگای دهۆك و ئەو بڕیارەی ساڵی ١٩٩٦ کە قەزای مەخمووری لە پارێزگای هەولێر پێدابڕاند، نەك ئیجماعی هەر سێ ئەندامانی ئەنجومەنی سەرۆکایەتی کۆمار، چونکە کەسێك، یان لایەنێکی شۆڤینی شتێك بەزۆر زەفت بکات، یان هاوڕەگەزەکانی بە زەبری هێز بۆیان دابڕاندبێت چۆن هەروا بە ئاسانی ڕازی دەبێت لەسەر ئیجماعی گەڕاندنەوەی بۆ خاوەنی، یان پارێزگای ئەسلی؟ جا بۆیە ئەم میکانیزمە سەقەتە و ناڕەوایە، چونکە ئیجماعی هەر سێ ئەندامی ئەنجومەنی سەرۆکایەتی کۆمار مەرجێکی تەعجیزییە، نوێنەرانی لایەنی عەرەبی سوننی بە ئانقەست لە یاسای ئیدارەی کاتی و پاشانیش لە دەستوور چەسپاندوویانە، هەربۆیەش جێگری عەرەبی سوننی قەت ئامادە نەبوو و کردی بە بیانووی دەستووریی ڕازینەبوون، بە پاساوی بێ بنەمای یاسایی و مەنتیقی و ناکۆك لەگەڵ خودی ناوەرۆکی بڕگەکە و مەبەستی دەستوور لەم بارەیەوە! بۆیە پەسەندکردنی ئەم میکانیزمە ناکۆکە لەگەڵ مەبەستی سەرەکی ماددەی (٥٨)ی یاسای ئیدارەی کاتی و چەسپاندنیشی لە دەستووری هەمیشەیی بەم شێوە سەقەت و ناڕەوایە دوو هەڵەی یەکجار گەورەبوون، کە نوێنەرانی لایەنی کوردستانی لە کاتی نووسینی یاسای ئیدارەی کاتیی و لەکاتی دانانی دەستووری هەمیشەییشدا لەم بارەیەوە تێیکەوتوون.

لە ڕاستیدا ئەمە "فیلێکی یاسایيە" کاتی خۆی لە لایەن نوێنەرانی عەرەبی سوننی بەتایبەتی لە نوێنەرانی لایەنی کوردی کراوە! (نووسەری ئەم بابەتە لە٢٠ی تەمووزی٢٠٠٥ لە بانگکردنێکی ڕاوێژکاریی تایبەتدا لە هاوینەهەواری سەلاحەددین، سەرنجیانی ڕاکێشا بۆ ئەم هەڵەیە و بۆ ئاکامەکەی و بۆ پێویستیی چارەسەرکردنی مەسەلەکە پێش ئەوەی بچەسپێت لە دەستووری هەمیشەییدا). هەروەها جگە لەم هەڵەیە، هەڵەیەکی گەورەی دیکەش لە نووسینی دەستووری هەمیشەیی ڕوویداوە و نوێنەرانی لایەنی کوردی پێی ڕازی بوون، ئەویش بریتییە لە نەمانی جەوهەری ماددەی (٤) ی یاسای ئیدارەی کاتی، کە دروستترین پێوەری دەستنیشانکردنی سنووری هەرێمەکانی تێدا بوو، واتە **ڕاستییە مێژوویی و جیۆگرافییەکان**، بەڕاستی جێگەی سەرسوڕمانە کەوا پێوەری ئەم ماددە گرنگە هەرنەما لە دەستووری هەمیشەیی. **بۆیە** ئێستا تەنیا پێوەری دەستووریی دەستنیشانکردنی سنووری هەرێمی کوردستان ماددەی (١٤٠)ە. هەروەها لایەنی کوردی هەڵەیەکی زۆر گەورەی دیکەی کرد، کە ماددەی (١٤٠) لەکاتی دیاریکراوی خۆی لە دەستووردا واتە تا ٢٠٠٧/١٢/٣١ جێبەجێنەکرا، چونکە نە فراکسیۆنی هاوپەیمانی کوردستانی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق و نە پەرلەمان و نە حکومەتی هەرێمی کوردستان هیچ کاردانەوەیەکی یاساییان لەم بارەیەوە نەبوو! (هەرچەندە نووسەری ئەم گوتارە، لە دانیشتنێکی ڕاوێژکاریی بەپەلە لە نێوان بەرپرسی لێژنەی بەدواداچوونی جێبەجێکردنی ماددەی (١٤٠)ی پەرلەمانی کوردستان و ١٠ پسپۆڕ و مامۆستای زانکۆی سەلاحەددین لە بوارەکانی یاسا و سیاسەت و جیۆگرافیا لە ڕێکەوتی ٢٠٠٧/١٢/١٥، بۆ ئەم ئەگەرە کە پێشبینیی دەکرا جەختی لەسەر ئاڕاستەکردنی

سکاڵانامەیەك بۆ دادگای ئیتیحادی باڵا لە بەغداد کردەوە)، چونکە لەو حاڵەتە دادگای باڵا بەپێی یاسا و لەبەر ڕۆشنایی دەستوور و بە تاوتۆیکردنی بارودۆخەکە بە بڕیارێکی یەکلاکەرەوە حکومەتی ئیتیحادی پابەند دەکرد بە جێبەجێکردنی ماددەی (١٤٠) لە کاتێکی دیاریکراوی دیکەدا، لەبەرئەوەی ئەم دادگایە بەرزترین مەرجەعی دادوەرییە لە عێراق و لێکدانەوەی دەستوور و چارەکردنی کێشە لە نێوان حکومەتی ئیتیحادی و حکومەتی هەرێمەکان لە پسپۆڕیی و کارەکانییەتی (بە پێی ماددەکانی ٩٣ و ٩٤ ی دەستووری هەمیشەیی عێراق)، بەڵگەش بۆ ڕاستی ئەم هەڵسەنگاندنە زانستییە: دانپیدانانی قازی (جعفر ناصر) ئەندامی دادگای ئیتیحادی باڵایە بەم مەسەلەیە، کە لە دیمانەیەك لەگەڵ ڕۆژنامەی (ڕووداو) ژمارە (٩٤)ی ڕۆژی ٢٠١٠/٠١/٢٨ دا بە ڕوونی دەردەکەوێت و گوتوویەتی: "*کەس ئەم گرفتەی نەهێناوەتە لای ئێمە، ئەگینا بە پێی دەستوور چارەمان دەکرد*". بێگومان قازییەك کە ئەندامە لەم دادگایە، باش لە کار و پسپۆڕییەکانی دادگای باڵا تێدەگات و چاکتر لە کەسانی دیکە بەرپرسیی و ئەرکی سەر شانی خۆی و هاوکارەکانی دەزانێت.

بەهەرحاڵ: میکانیزمی جێبەجێکردنی پوختەی ماددەی (١٤٠)ی دەستوور، واتە ناوەڕۆکی بڕگەی (ب) ماددەی (٥٨)ی یاسای ئیدارەی کاتی کە بووەتە بەشێك لە ماددەی (١٤٣)ی دەستوور، قفڵە. تا ئەم قفڵەش (لە چوارچێوەی هەموارکردنی دەستوور و بە هاوکاری کۆمسیۆنێکی ڕاوێژکاری باڵا و هەوڵی سەرکردایەتی سیاسی و حکومەتی هەرێمی کوردستان) نەکرێتەوە، گرنگترین بەشی ماددەی (٥٨) کە جەوهەری ماددەی (١٤٠)ە، جێبەجێناکرێت — دەبێت گشت پەیوەندیداران و بەرپرسانی کورد باش لەم ڕاستییە بگەن، هەرچەند تاڵیش بێت. هەروەها تاوەکو

ناوەرۆکی بڕگەی (ب)ش جێبەجێ نەکرێت، ناوەرۆکی بڕگەی (ج) جێبەجێ ناکرێت، چونکە ئاشکرایە تا ئاساییکردنەوە ئەنجام نەدرێت، نابێت سەرژمێریی و ڕاپرسیی لەم بارەیەوە (وەك قۆناخی دووەم و سێیەم) ئەنجام بدرێن، ئەگینا لەسەر حسێبی کورد و کوردستان دەبن. بۆیە پێویستە لایەنی کوردی باش ئاگاداری ئەم مەسەلەیەش بێت. جگە لە مانەش بڕگەی (ج)ی ماددەی (٥٨) کە بناغەی ماددەی (١٤٠)ە، چەند کەموکورتییەکی دیکەی تێدایە. بۆ نموونە: لە بارەی زاراوەی "خاکە کێشە لەسەرەکان "لە نێوانیاندا کەرکوك ...، جگە لە کەرکوك هیچ شوێنێکی دیکە دیارنەکراوە، ئاماژەش نەکراوە بە زاراوەی (پارێزگا)ی کەرکوك، چونکە ئەسلی مەسەلەکە گشت پارێزگای کەرکووکە، نەك تەنیا شاری کەرکووك، هەربۆیەش ڕژێمی بەعس چوار قەزاکەی واتە پتر لە نیوەی پانتاییەکەی لێدابڕاندووە و بەم شێوەیەی ئێستا بچووکی کردووەتەوە. هەروەها پرسیاری **چوارچێوەی** ڕاپرسیی ڕوون نەکراوەتەوە، (چونکە دەبێت لە چوارچێوەی "ناوچە کێشە لەسەرەکان" لە بواری سنووری ئیدارییەوە بێت: واتە لە چوارچێوەی گشت پارێزگای کەرکووکی ئەسلی و لە چوارچێوەی قەزاکانی خانەقین و مەندەلی و شێخان و سنجار و ناحیەکانی تلکیف و قەرەقوش و زمار ... بێت) و دەبێت مەسەلەی قەزای مەخموریش بە جیاو بە زووترین کات و لە دەرەوەی مەسەلەی "ناوچە کێشە لەسەرەکاندا" چارەسەر بکرێت، لەبەر ئەوەی قەزای مەخموور تا ساڵی ١٩٩٦ کێشە لەسەر تابعییەتی بۆ پارێزگای هەولێر نەبووە دەبوایە ئەم مەسەلەیە و مەسەلەی چەسپاندنی گەڕانەوەی قەزای ئاکرێ بە ڕەسمی و لەسەر نەخشەی دەوڵەتی عێراقیش بۆ سەر پارێزگای ئەسڵی خۆی (دهۆك) هەر پاش پەسەندکردنی دەستووری هەمیشەیی چارەسەر بکرابوان. هەڵەیەکی دیکەی بڕگەی

(ج)ی ماددەی (٥٨) چەسپاندنی چەمکی "الأراضي المتنازع عليها" واتە "خاکە کێشە لەسەرەکان"ە، کە هەم لە بواری یاسایی و هەم لە بواری سیاسی ناڕەوایە، چونکە ڕژێمی بەعس ئەم خاکانەی بە زۆر لە ساڵەنی ١٩٧٤ و ١٩٩١ لە خاك و قەوارەی "ناوچەی حوکمی زاتی" و "پەناگەی ئارام" لە کوردستان دابڕیوە و لە بواری دەربڕینیش زاراوەیەکی نەگونجاوو ئیستیفزازی و مایەی نائارامی و ڕك و کینەیە، بۆ چاکردنەوەی هەڵەکان پێویستە ئەم خاڵەش لەبەرچاو بگیرێت و شێوەیەکی دیکەی گونجاو و کۆك بچەسپێندرێت.

بۆیە ئەگەر لایەنی کوردی بیەوێت ماددەی (١٤٠) بەکردەوە جێبەجێبکرێت: دەبێت پێش هەموو شتێك میکانیزمی برگەی(ب)ی ماددەی (٥٨) و کەم و کورتییەکانی بڕگەی (ج)ی ئەو ماددەیە چاکبکرێنەوە، ئەمەش دەکرێت لە ڕێگەی هەموارکردنی بڕگەی (ب) و (ج)ی ماددەی (٥٨) یاسای ئیدارەی قۆناخی گواستنەوە بێت، کە بووەتە بەشێك لە ماددەی (١٤٣) دەستووری هەمیشەیی و کرۆکی ماددەی (١٤٠)ە، بە پێی پێشنیاری لایەنی کوردی (فراکسیۆنە کوردییەکانی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق)— بە هاوکاری (کۆمسیۆنێکی ڕاوێژکاری کوردستانی باڵا)، کە دەبێت بە زووترین کات لە پێناوی چارەکردنی گرفتی ماددەی (١٤٠) و گشت کێشە هەڵواسراوەکان لە نێوان حکومەتی هەرێم و حکومەتی ئیتیحادیدا لە لایەن سەرۆکایەتی و حکومەتی هەرێمی کوردستانەوە پێکبهێنرێت، لە پسپۆڕی لێهاتوو و دڵسۆزی زانستەکانی سیاسەت، یاسا، ئابووری، جیۆگرافیا، مێژوو، کۆمەڵناسیی و سوپایی. ئەم کارەش دەبێت لە چوارچێوەی هەموارکردنی دەستووری هەمیشەیی عێراقیدا بکرێت، کە دەبێت بە گوێرەی ماددەی (١٤٢)ی دەستوورەوە ئەنجام بدرێت.

هەروەها بۆ چارەسەرکردنی کێشەی ناوچە دابڕێندراوەکانی کوردستان (کە ڕژێمی بەعس بە ناهەق لە قەوارەی "ناوچەی ئۆتۆنۆمی" و "پەناگەی ئارام" دایبڕیون) و کێشەی سنووری باشووری هەرێمی فیدرالی کوردستان (کە لە دەستووری هەمیشەیی پێوەریشی یەکلانەکراوەتەوە) بە شێوەیەکی بنەڕەتی: دەبێت ماددەی (١٤٣)ی دەستوور هەموار و تەواوبکرێت، چونکە لە بڕگەی (أ) ماددەی (٥٣)ی یاسای ئیدارەی کاتییێش فێڵێکی دیکەی "یاسایی" لە کورد کراوە (یان لە ئەنجامی فشاری دەرەکی نوێنەران قبوولّیان کردووە و ئاکامەکەشی گرفتێکی یەکجار سەختی پەیداکردووە)!، لەبەر ئەوەی لەم بڕگەیەدا هەرچەندە دان بە حکومەتی هەرێمی کوردستاندا نراوە، بەڵام لە سەر ئەو خاکانەی (ئەرزانەی) کە لە ڕۆژی ٢٠٠٣/٠٣/١٩ لە ژێر دەسەڵاتیدا بوون، واتە لە چوارچێوەی " قەوارەی پەناگەی ئارام " Safe Haven) – " دا، واتە بێی ناوچە دابڕێندراوەکان لەلایەن ڕژێمی بەعس. ئەم بڕگەیەش بووەتە بەشێك لە ماددەی (١٤٣)ی دەستوور، بۆیە دەبێت ئەم مەسەلەیەش، واتە کەموکورتییەکەی ئەم بڕگەیەش، کە لە ماددەی (١١٧)ی بنەڕەتی و گرنگی دەستووریش ڕەنگی داوەتەوە، تەواوبکرێت، بە هێماکردن بە پێویستیی دیارکردنی سنووری دروست و هەمیشەیی هەریمی فیدرالی کوردستان (لە سەر بنەڕەتی: ڕاستی بەڵگە مێژوویی و جیۆگرافی و سەرژمێرییە فەرمییە عێراقییەکانی پێش ڕژێمی بەعسی ستەمکار.

ئەم گوتارە لە ژمارە ٢٨ی ساڵی ٢٠١٠ ی گۆڤاری (١٤٠) بڵاوکراوەتەوە.

## چەند پرسیارێکی سایتی (سبەی) سەبارەت بە ماددەی (١٤٠)

٢٠١١/١٢/٦

**- سپێدە: مەسەلەی خاکی کوردستان، خاڵی سەرەکی ناکۆکی نێوان کوردو بەغداد بووە لەهەموو شۆڕشەکاندا، دوایساڵی (٢٠٠٣) و رووخانی رژێمی سەدام کورد چۆن مامەڵەی لەگەڵ ئەو دۆسیەیە کردوە؟**

**- ئەم مەسەلەیە دەبوایە لە سێ بوار کاری بۆ کرابوا:**

 لەبواری سیاسی: دەبوایە نوێنەرانی کورد پێش رووخانی رژێمی بەعس لەگەڵ لایەنەکانی ئۆپۆزسیۆنی عێراقی ڕێکبکەون، هەم لەسەر یەکلاکردنەوەی پشتگیرییکردنی سیستەمی دیموکراتی و پرنسیپی فیدرالیزم لە عێراقی نوێدا، هەم لەسەر چەسپاندنی پێوەری بنەڕەتی دیاریکردنی قەبارەی هەرێمی کوردستان — ڕاستی و بەڵگە جیۆگرافی و مێژوویی و سەرژمێرییە رەسمییە عێراقییەکانی پێش خۆسەپاندنی رژێمی بەعسی ستەمکار، واتە سەرژمێریی ساڵی (١٩٥٧) - و هەم لەسەر راستکردنەوەی سنوورە ئیدارییە شێواندراوەکانی پارێزگاکان لەساڵێنی ١٩٧٥ و ١٩٧٦ لەلایەن ڕژێمی بەعس بەگشتی و ئەو پارێزگایانەی زۆربەی دانیشتووانیان کوردن (کەرکووك و هەولێر و دهۆك) بەتایبەتی. چونکە مەسەلەی سنووری ئیداری گۆڕاوی پارێزگاکان هەردوو پارێزگای کەربەلا و بەغدادیش دەگرێتەوە، بەدەستهێنانی پشتیووانی لایەنە سیاسییە عەرەبییە شیعییەکان لەم بارەیەوە ئاسان بوو.

* لەبواری یاسایی (دەستووری): دەبوایە لە تەك دەستنیشـانكردنی ڕاسـتی مێژوویی و جیۆگرافی لە "یاسای ئیدارەی دەوڵەتی عێراق بۆ قۆناخی گواستنەوە"، وەك پێوەر بۆ دیاریكردنی قەبارەی یەكە فیدرالییەكان لـە مـاددەی (٤)، پێـوەری سەرژمێری ساڵی (١٩٥٧)یش بۆ ئەم مەبەستە بچەسپێندرایە. هەروەها نەدەبوایە دانپێدانان بە هەرێمی فیدرالی كوردستان لـە بڕگـەی (ا)ی مـاددەی (٥٣)ی ئـەو یاسایە (كەوەك دەستوورێكی كاتی بوو) لە چوارچێوەی "پەناگـەی ئـارام" تەسـك بكرێتەوە، واتە تـەنیا ئـەو ئەرزانـەی حكومـەتی هـەرێمی كوردسـتان لـە ڕۆژی ٢٠٠٣/٣/١٩ دەسەڵاتی بەسەردا هەبوو، چونكە ئەمـە بـە ئاشـكرا چەسـپاندنی وەلانانی ناوچە دابڕێندراوەكانە، هەروەها نەدەبوایە بڕگەی (ب)ی مـاددەی (٥٣) لەلایەن نوێنەران و بەرپرسە باڵاكانی كوردەوە پەسەندكرابوایە، چونكە ئەمەش بـە ئاشكرا دانانی كۆسپێكی دوو ساڵیی بوو لەبەردەم جێبەجێكردنی جەوهەری بڕگەی (ب)ی ماددەی (٥٨)ی ئەم یاسـایە، كـە پێوەسـتە بـە چارەسـەركردنی سـنوورە ئیدارییە گۆڕاوەكانی پارێزگاكان. هەروەها نەدەبوایە میكانیزمی جێبەجێكردنی ئەم بڕگەیەی ماددەی (٥٨)، كە بریتییە لە كۆدەنگی (اجماع)ی دەستەی سـەرۆكایەتی كۆمار، لەجیاتی هەڵوەشاندنەوەی بڕیارەكانی "**مجلس** قیادەی بەعس" سەبارەت بەم كـردەوە زۆرەملێیـە نارەوایـەی ڕژێمـی ڕووخـاو، لەلایـەن نوێنـەرانی كـوردەوە پەسەندبكرابوایە، چونكە ئەمـە مـەرجێكی تەعجیزییـە و گـەورەترین تەگـەرەی یاسایی بەردەم جێبەجێكردنی جەوهەری ماددەی (٥٨)ە، كە پاشان بووە بنـەمای ماددەی (١٤٠)ی دەستووری هەمیشەیی عێراق. هەروەها نەدەبوایە ئـەم هـەموو هەڵە و نارەواییانە پاشان لە دەستووری هەمیشەییش بچەسپێندرابووان - لە جیاتی

چاككردنەوەیان، لەمەش خەراپتر پێوەری دروستی دیاریكردنی قەبارەی یەكە فیدراڵییەكان كە لە "یاسای ئیدارەی دەوڵەت دا هەبوو، لە دەستووردا هەر نەما!! نەدەبوا (ناوچە دابڕێندراوەكان لە هەرێمی كوردستان) نازناوی "ناوچە كێشە لەسەرەكانی" بەسەردا بسەپێندرێت و ئاواش بچێتە نێو دەستوور(...) .

* لە بواری سوپایی: دەبوایە پێداگریی لەسەر بوونی هێزی هاوبەشی هەردوو حكومەتی فیدراڵی و هەرێمی كوردستان لەو ناوچانە بكرێت، بەلای كەم تا یەكلاكردنەوەی مەسەلەكە، تا خەڵكەكە لە لایەن تێرۆریستان و شۆڤینیستانی عەرەبەوە چیدیكە لەناو نەبردرابوان و نەتۆقێندرابووان و جارێكی دیكە ئاوارە و دەربەدەر نەكرابووان و پرۆسەی رەگەزپەرستانەی بەعەرەبكردن (تەعریب)ی ناوچە دابڕێندراوەكان، بە شێوەیەكی دیكە بەردەوام نەبوایەو نەبێت.

- ماددەی (١٤٠) كە تایبەتە بە كێشەی ئەو ناوچانەی كە لەكوردستان دابڕێنراون، بەستنەوەی خاك بە مادەیەكی دەستوورو راپرسیەوە، ئالیەتێكی گونجاو بوو، یان دەكرا كورد رێگەی دیكە بگرێتەبەر؟

* لە ڕاستیدا بنەمای ماددەی (١٤٠) بۆ چارەسەركردنی دەستووریی گرفتی سنووره ئیدارییە گۆڕاوەكانی هەموو پارێزگاكانی عێراقە بە گشتی و بۆ چارەسەركردنی كێشەی ناوچە دابڕێندراوەكانی هەرێمی كوردستانە بە تایبەتی، بەڵام نیوەچڵ و ناكۆكە. دەكرا دەستنیشانكردنی قەبارەی هەرێمی كوردستان بە پێی ڕێكەوتنێكی تایبەت بە شایەتی و مسۆگەریی چەند دەوڵەتێكی گرنگ بوایە، وەك پاشكۆیەكی "یاسای ئیدارەی كاتی"، یان لە ڕێگەی ماددەیەكی دیكە یان

میکانیزمێکی دروست بوایە: لە هەردوو حاڵەت بە چەسپاندنی پێوەری سەرژمێری ساڵی ١٩٥٧، بۆ دەستنیشانکردنی ناوچەکانی هەرێمی کوردستانی — عێراق.

**- سپێدە: بۆ بەدواچون و چارەسەرکردنی ئەو کێشەیە چەندین لیژنەی باڵاو لیژنەی پەرلەمانی و لیژنە لەلایەن حکومەتی عێراق و هەرێمەوە پێکهێنرا، رۆڵی ئەو لیژنانە چۆن دەبینیت، پێشنیاری تۆ چییە بۆ بەدواداچونی ئەو دۆسیەیە لەلایەن سەرکردایەتی هەرێمی کوردستان و نوێنەرانی کورد لەبەغداد؟ هەنگاوەکانی جێبەجێکردنی ئەو مادەیە چۆن چوونەتە پێشەوە؟**

* بواری کارکردنی ئەم لیژنانە گونجاو و لەبارنەبووە، هەروەها رۆڵی زۆربەیان لە ئاستی گرنگیی مەسەلەکە و بەرپرسیارییەتی ئەرکەکە نەبووە. وەڵامی ئەم پرسیارە بە وردی لە تەوەری یەکەمی لێکۆڵینەوەکەی هەڵسەنگاندندا روونکراوەتەوە.

**- سپێدە: یەکێکی تر لە کێشەکانی کورد لەگەڵ ناوەند، مەسەلەی رێژەی راستەقینەی کوردە لەعێراقدا، بێگومان ئەوەش بە سەرژمێری دەکرێت، بۆچی تائێستا ئەو سەرژمێریە نەکراوە، مەترسی هەیە لەسەر ئاشکرابوونی رێژەی راستەقینەی هەر پێکهاتەیەك لە عێراقدا؟**

* پێوەری زانستی و دروستی زانینی رێژەی گشت پێکهاتە نەتەوەیی و ئایینییەکانی دانیشتووانی هەموو دەڤەرەکانی دەوڵەتی عێراق سەرژمێرییە (سەرژمێرییەکی پاك و چاك، واتە رەوا)، کە دەبێت دەزگا و دەستە و لیژنەکانی سەرپەرشتیکردن و بەرێوەبردنی روون و هاوسەنگ و دادپەروەر بن، لەژێر چاودێری چاودێرانی نێودەوڵەتی بێلایەن ئەنجام بدرێت. بەڵێ بە رای من هۆی سەرەکی

پەکخستن و دواخستنی پرۆسەی سەرژمێری ئاشکرانەبوونی ڕێژەی ڕاستی کورد و تورکمان و کلدان و ئاشووریە، بە تایبەتی کورد، پێش هەموو شتێك لەبەر کێشەی ناوچە دابڕێندراوەکان، هەروەها لەبەر هۆی دیکەش: ژمارەی ڕاستینەی کورسییەکانی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق، بودجەی واقیعی هەرێم و مەترسیی ئاشکرابوونی ناتەواویەکان و بەعەرب دانانی کەمەیاتییە نەتەوایەتی و ئایینییەکان، بە تایبەتی لە سەرژمێرییەکانی سەردەمی ڕژێمی بەعس.

- سپێدە: کوردو سەرکردەکانی چۆن مامەڵەیان لەگەڵ ئەو دۆسیەیە کردووە، چۆن دانوستانەکانی لەوبارییەوە بەڕێوەبردووە لەگەڵ حکومەتی ناوەندی؟

* ئەو سەرژمێریە چەند گرنگە بۆ کورد، ڕۆڵی دەبێت لەکارئاسانی بۆ قۆناغی دووەمی جێبەجێکردنی مادەی (١٤٠) کە ئەنجامدانی سەرژمێریە؟ یان ئەو مەسەلەیە یەکلادەکاتە کە ساڵانە کورد چەند بەشی خۆی لە بودجەی گشتی عێراق وەربگرێت؟

* وەڵامی ئەم دوو پرسیارە لە تەوەری سێیەمی هەڵسەنگاندنی ناوبراو دەردەکەوێت.

**- ڕێژەی ڕاستەقینەی کورد لەعێراقدا، پەیوەندی ڕاستەوخۆی هەیە بە دیاریکردنی کورسیەکانی کوردو ڕێژەی نوێنەرایەتیان لەدەزگا تەشریعی و تەنفیزیەکان، تۆ لە باسێکتدا دەڵێت لەو مەسەلەیەشدا فێڵ لە کورد کراوە؟**

* ئەم تێزە لە تەوەری دووەمی هەڵسەنگاندنەکە بە دوورودرێژی باسی لێوەکراوە.

**- لەدانانی یاسای هەڵبژاردنەکاندا تاچەند نوێنەرانی کورد سەرکەوتوو بوون؟ توانیویانە کورسیەکانی سێ پارێزگاکەی هەرێم و ڕێژەی نوێنەرایەتی کوردو هەرێمی کوردستان مسۆگەر بکەن؟**

* ئەمەش لەتەوەری دووەمدا ڕوونکراوەتەوە.

- سەبارەت بەکۆی کێشەکانی کورد لەگەڵ بەغدادا، چەندین شاندو لیژنە پێکهێنراون بۆ دانوستان لەگەڵ حکومەتی ناوەندی، ئایا نوێنەرانی کورد لەدانوستانەکاندا چەند سەرکەوتوبون؟ چەند توانیویانە ئیدارەی دانوستان و گفتوگۆکان بەڕێوە ببەن؟ یان چەند پەندیان لە بەڵێنە زارەکیەکان و شکستەکان لەو رووەوە وەگرتوە؟

* بە ڕای من نوێنەرانی کورد لە گفتوگۆکانیاندا لەگەڵ حکومەتی ئیتیحادی، بە تایبەتی لەبارەی کێشە هەڵپەسێردراوەکان، سەرکەوتوو نەبوون. هۆی سەرەکی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ نەبوونی کۆمسیۆنێکی ڕاوێژکاریی بالا (کە پێویستە پێکبهێنرێت لە شارەزا و پسپۆرانی کارا و لێهاتووی زانستەکانی: سیاسەت، یاسا، ئابووری، مێژوو، جیۆگرافیاو سوپا، بۆ ڕاوێژکردنی سەرۆکایەتی هەرێم و سەرۆکایەتی حکومەتی هەرێم لە پێناوی چارەسەرییەکی ئاشتیخوازانە و دەستووریی ئەم کێشانە بە تایبەتی و گشت گرفتەکانی ڕێڕەوی پرۆسەی سیاسی لە هەرێمی کوردستان و لە عێراقی نوێ بە گشتی.